زنجیرەی ئیسلامناسی (١)

# گۆڕینەوەی بەهەشت بە دونیا





نووسینی

عبداللّه وریا هموند

پێداچوونەوەی

أحمد أبراهیم طاهر

ناوی کتێب : گۆڕینەوەی بەهەشت بە دونیا
نووسینی : عبدالله وريا هموند
پێداچونەوەی : أحمد إبراهيم طاهر
نەخشەسازی بەرگ : ئاریز عزیز
نەخشەسازی ناوەوە : عبدالله وريا هموند
نۆرە و ساڵی چاپ : یەکەم - ١٤٣٧ك - ٢٠١٦ز
چاپخانەی : ناوەندی ئاوێر
نرخ :
تیراژ : ١٠٠٠
ژمارەی سپاردن : لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان
ژمارەی سپاردن (٢٨١) ی ساڵی ٢٠١٦ ی پێدراوە .

# پێشەکی

إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ نَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا ، مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ، يا أيها الذين ءامنوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلا تَمُوتُنَّ إِلا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ ، وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ، يَأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلا سَدِيدًا يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ، وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا

زۆر سوپاسی خوای گەورە دەکەم کە هیدایەتی داوم بۆ سەر ڕێگای ڕاست و لەسەر ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئامۆژگاری کردوم وە زۆر بەختەوەرم کە توانیم ئەم کتێبە بچوکە تەواو بکەم بە هاوکاری لەگەڵ کاك ( احمد ابراهیم طاهر) کە توانی پێداچونەوەی هەڵەکانم بکات . بیرۆکەی ئەم کتێبە پێشتر هەمبوو بەڵام زیاتر بە هاندانی مامۆستای خۆشەویستم

ماموّستا (محمد بزاز) لەمێشكمدا جەكەرەی كردووە، كە هانی داین بۆ كتێبب خوێندنەوە ومنیش هەستام بە بەرەو پێش بردنی بیرۆكەكەم و لە كۆتای توانیم ئەم كتێبە بچوكە دروست بكەم كە تیایدا باسی بەهەشت و تاوان و تەوبە بكات، ئەم بیرۆكەی كە بۆم هات تەنها بۆ ئەوە بوو بیری ئەم خەڵكە بهێنمەوە بەهەشتێك هەیە  پرە لە خۆشی و شادی و نازو نیعمەت وە  باسكردنی لەخوا نەترسان و لاوازی ئیمان لەگەڵی دا چونكە لاوازی ئیمان ولەخوانەترسان هۆكارن بۆ دووركەوتنەوەی ئادەمیزاد لە بەهەشتی خۆشی نەبڕاوەی خوای میهرەبان، هیوادارم ئەم پەرتووكە خنجیلانەیە بووبێتە هۆی ڕەزامەندی خوای گەورە و سوودێكم گەیاندبێت بە خوێنەری خۆشەویست.

---


**نووسینی**

عبدالله وریا هموند

**پێداچونەوەی**

احمد إبراهیم طاهر



١٤٣٧كۆچی ٢٠١٦ زاینی

## لە خوا نەترسان

خوای گەورە لەگەڵ دروست کردنی مرۆڤ سیفەتێکی پێ بەخشیوە کە ئەویش ترسە ، لەگەڵ لەدایك بوونی دەست پێ دەکات و لەگەڵ کۆچی دوای تەواو دەبێت ، بەڵام ئەوە ئەوە ناگەینێ کە لەهەمووو شتێك بترسین ، بەڵام دەبێ لەهەندێ شت بترسین ، هەروەکوو چۆن خودای گەورە باسی پێغەمبەر موسا ( علیه السلام)  دەکات کاتێك کە پیاوەکە دەکوژێ و هەلدێ لەدەست فیرعەون و پاشان بەدوای موسا دەگەرێن و موساش (علیه السلام)  دەترسێ هەر وەکو چۆن خودای گەورە باسی دەکات ﴿فَأَصْبَحَ فِي الْمَدِينَةِ خَائِفًا يَتَرَقَّبُ[1]﴾، ئەم جۆرە ترسە کە  دەبیت بترسی چونکە تۆ مرۆڤی لەو کاتەدا کە ئەم روداوانەت بەسەر دیت ، بەڵام نابێ لەهەندێك شت بترسین هەر وەکو ترس لە رزق و رۆزی چونکە خودای گەورە بەڵێنی پێ دایت کە خوای گەورە دەفەرموێ:  ﴿وَفِي السَّمَاء

[1] سورة القصص (١٨)

رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ[2] ﴾ واته : رزقی تۆ له ئاسمانه و هەروەکو چۆن بەڵێنی پێ دایت

بۆیه باشترین و چاکترین جۆری ترس ئەو ترسەیه که له خوای پەروەدگار هەتبیت ، خوای گەوره دەفەرموی: ﴿نَبِّئْ عِبَادِي أَنِّي أَنَا الْغَفُورُ الرَّحِيمُ (٤٩) وَ أَنَّ عَذَابِي هُوَ الْعَذَابُ الأَلِيمَ (٥٠)[3]﴾

واته : ئەی پێغەمبەر به عەبدەکانم رابگەینه که خوای گەوره لێبورده و بەبەزەییه (٤٩) وه عەزابی ئەو عەزابەیه که زۆر به ئازاره

(٥٠) . خوای گەوره دەمانترسێنێ به خۆی تاوەکو له عەزابەکانی بەدوور بین هەر وەکو چۆن دەفەرموێ:﴿وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ[4]﴾، ئیمامی طەبەری لەم ئایەته بۆمان باس دەکات که دەڵێت خوای گەوره له عەزابەکانی خۆی دەتان ترسێنێ ئەگەر ئێوه

---

[2] سورة الذاريات (٢٢)

[3] سورة الحجر (٤٩-٥٠)

[4] سورة أل عمران (٢٨)

سەرپێچی فرمانەکانی بکەن ، خوای گەورە لەسەر ئێمەی واجب کردووە کە لێی بترسین هەر وەکو چۆن دەفەرموێ: ﴿فَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ[5]﴾له لایەکیتریش دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِي[6]﴾

واتە : لەوان مەترسن و لەمن بترسن ،

مرۆڤ دەبی بترسێ هەروەکو چۆن باسم کرد ترسێکی بنچینەیەی وەکو حەزرەتی موسا ( علیه السلام ) کە باسم کرد وە ترسێکی تر کە گەورەترین ترسە ئەویش ترسان لە خودایە ، ئەگەر هاتوو لە خوای گەورە نەترسای ئەوە بزانە لە غەیری خواش دەترسێی بۆیە وابکە لە خوای گەورە بترسێی تاوەکو لە وانی تر نەترسی ، بۆیە ئەم ترسە یەکێکە لە نیشانەکانی ئیماندار هەر چۆن خودای گەورە دەفەرموێ :﴿فلا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ[7]

---

[5] سورة النحل (٥١)
[6] سورة البقرة (١٥٠)
[7] أل عمران (١٧٥)

واتە لەوان مەترسن و لەمن بترسن ئەی ئیمانداریندە ، ئەم ئایەتە ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە ترسان لە خودای گەورە شەرتێکە لە ئیمان ،

ترس لە خودای پەروەدگار عیبادەتێکی زۆر بەرز و گەورەیە چونکە ترسی خوای گەورە وات لێ دەکات کە گوناح نەکەی و دەست بۆ گوناح نەبەی ، بەڵام نەك لەترسی یەکێك لەخۆت گەورەتر گوناح نەکەی ئەوە عیبادەت نیە ئەگەر بەتەنها لە ترسی خوای گەورە نەبێت ، بۆیە ترس وات لێ دەکات کە ئەوشتانە وا دەکات لە گوناح بە دوور بیت و لە خودا نزیك ببیەوە وە وات لێ دەکات کە ئەو دڵە لە نەفام و جاهیلیدا بە ئاگا بهێنێتەوە وە ئایەتی قورئانیدا تەئسیرت لێ بکات هەر وەکو چۆن خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿مَا أَنْزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَى (2)إِلَّا تَذْكِرَةً لِمَنْ يَخْشَى (٣)﴾[8]

واتە ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەم قورئانەمان بۆ ئەوە دانەبەزاندوە بۆ سەر تۆ تاوەکو خۆت تووشی ماندووبوون

---

[8] طه (٢-٣)

بکەیت ، بەڵکو یادەخەرەوەیە بۆ ئەو کەسانەی کە یادی خوا دەکەن و لە خوا دەترسن ، ئەو دڵەی کاتێک قورئانی بەسەر دا دەخوێندرێتەوە دەلەرزێ وڕادەچڵەکێ ئەوە دڵی باوەرداره، خوایە ئێمەش وا لێبکەی کە دڵەکانمان لەکاتی بیستنی ناوی تۆدا ڕابچڵەکێ ولەکاتی خوێندنی قورئاندا ئیمانمان زیاد بکات ، ئەم ترسە وای کرد کە قورئان کار بکاتە سەر دڵی ئیماندار تاوەکو زیکر و تاعەتی خودا بکات . ترس لە خودا یەکێکە لە سیفاتەکانی ئیماندار هەر وەکو چۆن خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَاناً وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ[٩]﴾

واتە ئیماندار ئەو کەسەیە کە کاتێك یادی خوای و قورئانی بەسەردا خوێند ئەوە دڵیان ڕادەچلەکێ و ئیمانیان زیاد دەکات ، کاتێك تەمەشای پێغەمبەر دەکەین کە خوای گەورە لەهەموو گوناحەکانی خۆشبوە بەڵام لەگەڵ ئەوەش هەر لە

---

[٩] سورة الانفال (٢)

خودا دەترسا ، کاتێك هەورێك بهاتبایە ئەوا دەترسا و دەهات و دەرۆیشت دایە عەئیشە لێی پرسی بۆوا شلەژاوی وتی دەترسم ئەم هەورە عەزابێك بێت بۆ ئومەتەکەم چونکە پێشتر هەور عەزاب بوو ئومەتەکانی پێشتر ، بۆیە پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) ((إني لأرجو أن أكون أخشاكم لله[1] ))

واتە من رەجام وایە کە لەهەر هەموتان لەخواترستربم ،

بۆیە عبدالله ی کوری شخیر بۆمان دەگەرێتەوە و دەڵێت جارێکیان چووم بۆ ماڵی پێغەمەبەر (ﷺ) بینم کە نوێژی دەکرد و قورئانی دەخوێند بەڵام نوزە نوزی لێوە دەهات لەبەر گریان چونکە لە ترسی خودا دەگریا ، بۆیە هەردەم دوعای دەکرد و دەیگوت ئەی خوایە دڵم لەسەر ئەم دینە بهێڵەوە و سابتی بکە ، ئەگەر باسی صەحابەکان بکەین زۆر لەخوا ترساون وەکو ئەبو بەکری سدیق ( رەزای خوای لەسەر بێت ) هیچ جارێك نوێژی نەکردووە ئەگەر هەموو ریشی لە گریانا تەر نەبێ کە ئەوە یەکێکە لە ئەو ١٠ کەسەی کە

---

[1] رواه البخاری

موژدەیان پی دراوە بۆ بەهەشت کەچی هەموو نوێژێك هەر دەگریا، هەروەها ئیمامی عومەریش (رەزای خوای لەسەر بێت)بەهەمان شێوە لە نوێژەکاندا دەگریا ،رۆژێکیان لەنوێژدا گەیشتە سورەتی الطور کە دەفەرموێ﴿إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَاقِعٌ[1]﴾یەکسەر ئیمامی عومەر (رەزای خوای لێبێت) لە هۆش خۆی دەچێ و نەخۆش دەکەوی بەرِاددەیەک وای لێدێت کە خەڵك سەردانی بکات بە هۆی تووندی نەخۆشیەکەیەوە، وە لەکاتی سەرەمەرگیدا بە کورەکەی دەوت سەرم لەسەر پێخەف لابدە و بیکە سەر ئەم خۆڵە تا خوای گەورە رەحمم پێ بکات. ئا بەراستی ترسان لە خوادا بەمجۆرەیە . ئەی ئێمە ؟ بەخودا لەهەموو شتێك بترسێن لە خودا ناترسێن ، دەچین گوناح دەکەین تەنها لەبەر ئەم کاربەدەستە ، ناچینە مزگەوت نەوەکو پێی بڵێن ئیسلامی ، بەراستی ئەمە کارەساتە .

---

[1] سورة الطور (٨)

## ترسان لە خوا و ترسان لە مەخلوق

١- ترس لەخوا : لەئەنجامی لێکۆلینەوەی حەقیقەت و دووربینی و ووردبینیەوە دێتە کایەوە بەڵام ترس لە مەخلوق لە ئەنجامی بێئاگایی لە حەقیقەت و خۆپەرستی و تەسك بینیەوە دێتە کایەوە

٢- ترس لەخودا وا لەئادەمیزاد دەکات کە ژیانی یەکپارچە بێتە مایەی خزمەت کردنی کۆر و کۆمەڵ بە باشترین شێوە بەڵام ترس لە مەخلوق وا لە ئادەمیزاد دەکات کە ژیانی ببێتە باری زەحمەت و ناخۆشی بەسەر شانی کۆر و کۆمەڵ

٣- ترس لە خودا ئادەمیزاد جوان و نورانی دەکات لە رەنگ و روخساردا وەکو خوای گەورە لە سورەتی فتح دەفەرموێ ﴿سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ[١٢]﴾ ، بەڵام ترس لە مەخلوق ئادەمیزاد ناشرین و دەکات لە رەنگ و روخساردا ،وەکو خوای گەورە لەو بارەیەوە دەفەرموێ: ﴿يُعْرَفُ

---

[١] سورة الفتح (٣٢)

الْمُجْرِمُونَ بِسِيمَاهُمْ ﴾[1]

٤- ترس لە خودا بیروهۆشی ئادەمیزاد زیاد دەکات بەڵام ترس لە مەخلوق بیروهۆشی تەسك دەکات و ئادەمیزاد رەزیل و دەست قوچاوی دەکات

٥- ترس لە خودا سەبری و ئارامی لە سروشت زیاد دەکات بەڵام ترس لە مەخلوق سەبری و ئارامی لە سروشتی ئادەمیزاد کەم دەکاتەوە و دەیشلەژێنێ

٦- ترس لەخودا وا لە ئادەمیزاد دەکات کە هەردەم داواکاری حەق بێت بەڵام ترس لە مەخلوق وا لە ئادەمیزاد دەکات کە جێ بەجێ کاری داواکاری نەفسی خۆی بێت جا حەق بێ یانخود نا

٧- ترس لە خودا وا لە ئادەمیزاد دەکات کە ئازا و چەپوك وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە کە دەفەرموێ:((من خاف الله وحده خوف منه جميع خلقه )) واتە : ئەوەی بەتەنها لەخوا بترسێ خوا گشت مەخلوقی لێ دەترسێنێ بەڵام ترس

[1] سورة الرحمان (٤١)

لە مەخلوق ئادەمیزاد ترسنۆك و داوەشای دەكات  وەك لە ئەم فەرموودە هاتوە كە دەڵێ :

ئەوەی بەتەنها لەخوا نەترسێ واتە لە شتی تریش بترسێ ئەوە خوای گەورە  لە گشت مەخلوقی خۆی دەیترسێنێ

٨- ترس لە خودا بەرەكت دەێختە عیلم و زانیار و رزق رۆزی و ژیریەوە   بەڵام ترس لە مەخلوق بەرەكت لە عیلم و زانیاری و رزق و رۆزی لەدەباو بەرەكات ناهێڵێ

٩- ترس لەخودا خۆراكی گیانە و حەلاوە و شیرینی ئیمانی تێدایە و دڵ و دەروون ئاسوودە دەكات بەڵام ترس لە مەخلوق پیسی و چەپڵیەكی شەیتانەوە وەسوەسەیەكی درۆییینە وە روح و گیان پیس دەكات و دڵ و دەروون ئاسود ناكات و تێكی دەشكێنێ

١٠- ترس لە خودا ئادەمیزاد شیفا دێنێ لە نەخۆشیە نەفسی و دەروونی و كۆمەڵایەتیەكان بەڵام ترس لە مەخلوق ئادەمیزاد تووشی نەخۆشیە دەروون و كۆمەلایەتیەكان دەكات

١١- ترس لەخودا مایەی هیدایەت و راستە و شەقامی ژیانە بەڵام ترس لە مەخلوق مایەی گومرایی و سەرگەردانی وڕێگا بزرکردنە

١٢- ترس لەخودا رێکی حەق و عیلم و ئەقڵ و فیکرەی ئادەمیزادە بەڵام ترس لە مەخلوق نارێکە لەگەڵ حەق و عیلم و ئەقڵ و فیکرەی ئادەمیزادە

١٣- ترس لەخودا والە ئادەمیزاد دەکات لەهەموو کارەکانا حەکیم و دانابێ بەڵام ترس لە مەخلوق وا لە ئادەمیزاد دەکات کە حەقیقەتی حەکیمایەتی و دانایاتی لێ وون بێت

١٤- ترس لەخودا برایەتی و خۆشەویستی و هێزی خێرخوازی دروست دەکات بەڵام ترس لە مەخلوق برایەتی و خۆشەویستی تێك دەشکێنێ

١٥- ترس لە خودا سەرئەنجامێکی باش و چاوەرێی دەکات وەکو بەهەشت کە پڕە لە نیعمەتەکانی خودا بەڵام ترس لە مەخلوق سەرئەنجامێکی خراپی بەدی چاوەرێ دەکات لە جەهەنەم وە پەشیمانی و نەدامەتە

بەرێزەکەم : تۆ کاتێك دەرگا لە سەر خۆت دادەخەیت، بەشێوەیەك کە کەس ناتبینێت، لەو کاتەشدا پاڵنەرە شاراوەکانی ئارەزووت دێنەچالاکی و جووڵان و بەدوای دەروازەیەکدا دەگەڕێن کە لە ڕێگەیەوە بڕۆنە دەرەوە، ئا لەو کاتەدا و پێش ئەوەی ئەندامەکانت بخەیتەگەڕ بۆ ئەنجامدانی هەر تاوانێك، بیر لەوە بکەرەوە کە خوای گەورە دەتبینێ و دەزانێ چی لە ناختدا هەیە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْكَبِيرُ الْمُتَعَالِ (9) سَوَاءٌ مِنْكُمْ مَنْ أَسَرَّ الْقَوْلَ وَمَنْ جَهَرَ بِهِ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍ بِاللَّيْلِ وَسَارِبٌ بِالنَّهَارِ[١٤]﴾

واتە :خوای گەورە زانایە بە هەموو بینرا و و پەنهانییەك و لە هەموو شتێك گەورەترە و بڵند و باڵادەستە بە سەر هەموو شتێکدا، یەکسانە بە لای ئەوەوە ئەگەر ئێوە ووتەی ئاشکرا بکەن یان بیشارنەوە، یان لە تاریکی شەودا تاوان بکەن یان بە ئاشکرا و لە ڕۆژی ڕووناکدا ئەنجامی بدەن . بۆیە برام و خوشکی خۆم تۆ ئەگەر لەو کاتەدا ئەم ڕاستیە بێنیتە یاد و

[1] سورة الرعد (٩-١٠)

پێش چاوی خۆت ئەوا هەرگـیز ناوێری تاوانەکە بکەی، شاعیر دەڵێت :

**وإذا خلـوت بريبـة في خلـوة والنفس داعية إلى العصيان**

**فاستحيي من نظر الإله وقل لهـا إن الذي خلق الظلام يراني**[١٥]

واتە :ئەگەر لە کاتی خەڵوەت و تەنیاییدا تووشی دڵە ڕاوکێیەك بووی و نەفست بۆ لای تاوان ڕای دەکێشایت، ئەوا شەرم بکە لە وەی کە خوای پەروەردگار دەتبینێت و بەنەفست بڵێ :ئەی نەفسی بەدکارم ئەوەی کە تاریکی درووست کردووە دەمبینێت

---

[1] ما بين انا و احلامي ديوان الشاعرة مي محمد

## لاوازی ئیمان

### سەرەتایەك بۆ ئیمان و باوەر :

ئەبوهریرە(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ:ڕۆژێك پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) لەناو خەڵکیدا دەرکەوت، پیاوێك هاتە خزمەتی ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا باوەڕ چیە؟ فەرمووی: (باوەڕت هەبێت بەخوا، بەفریشتەکانی، بەکتێبەکانی، بەپێغەمبەرانی، بە رۆژی دوایی. هەروەها باوەڕت هەبێت بە قەدەر و خەیر و شەڕی)

مانای باوەڕ لە زمانی عەرەبیدا بە واتای بەڕاست زانین(التصدیق) دێت، وە ماناکەی لە فەرمودەکەی پێشودا ئەوەیە: دەبێت مرۆڤ بەڕاستێکی تەواو بڕوای وا بێت کە تەنها خوای گەورە شایستەی پەرستنە؛ لەبەر ئەوەی هەموو شتێکی بەدەستە وەسف کراوە بە هەموو سیفاتێکی تەواو وبە بێ کەم وکورتیەوە باوەڕمان وایە کەوا فریشتەکان

بەندەی ڕێزلێنراوی خوای گەورەن وسەرپێچی فەرمانەکانی خوای گەورە ناکەن، بەڵکو ئەوان فەرمانەکان جێبەجێی دەکەن وهیچ شتێك لە خۆیانەوە ناکەن, وە فریشتەکان چەند بەشێکن بەنسبەت ئەو کارانەی کە خوای گەورە پێی سپاردوون لەوانە :هەڵگرانی عەرش وئەوانەی لە دەوروبەری عەرشدان وئەوانەی لە حەوت تەبەقەی ئاسماندان کە خەریکی پەرستن وئەوانەی کەتایبەتن بە بەهەشت و ئاگر، وە ئەوانەی کە تایبەتن بە کاروباری سروشتی وئەوانەی کە گیان کێشانی دروستکراوەکانی پێ سپێردراوە لە کاتی مردندا، وە ئەوانەی کە فووکردن بە (صور) ی پێ سپێردراوە، وە ئەوانەی کە تەگبیری کاروبار دەکەن کە کاروباری باران و و ڕووەکی پێ سپێردراوە.

خوای گەورە دەفەموێ: ﴿ فَالْمُدَبِّرَاتِ أَمْرًا[16]﴾

واتە: سوێند بەو فریشتانەی کە تەگبیری کاروبار دەکەن، وە ئەوانەی کە کاروباری باران وڕووەکی پێ سپێردراوە، وە

---

[1]سورة النازعات (٥)

ئەوانەی کە کۆرلەپەی ناو ڕەحمی ئافرەتیان پێ سپێردراوە، وە ئەوانەی کە مرۆڤ دەپارێزن، وە ئەوانەی کە نووسینی کردەوەکانی مرۆڤیان پێ سپێردراوە، وە ئەوانەی کە چیاکانی پێ سپێردراوە، وە ئەوانەی کە دەگەڕێن لە زەویدا وئامادەی مەجالیسی زیکر وعیلم دەبن...وە غەیری ئەمانە کەوا بەڵگەیان لەسەر هاتوە لە فەرموودە صەحیحەکانەوە، وە باوەڕمان بە هەموو ئەو پەرتووکانە هەیە کەوا خوای گەورە بۆ پێغەمبەرانی ناردۆتە خوارەوە، وە ناوی هێناون لە قورئانی پێرۆزدا، لەوانە: تەورات و ئینجیل وزەبوورو صوحوفی ئیبراهیم وموسی، وە ئەوانەی کە ناوی نەهێناون. وە بەراست زانینی ئەوەی کە قورئان باسی کردوە لە بوونی لادان وگوڕان لەو نوسخانەی تەورات ئینجیل کە ئێستا هەن لەبەر دەستی خەڵکیدا .وە شوێنکەوتنی ئەو پەرتووکانە مەنسوخ کراوە بە قورئانی پیرۆز؛ چونکە قورئانی پیرۆز تاکە پەرتووکە کەوا پێویستە هەموو مرۆڤ وجنۆکەکان جێبەجێی بکەن وکاری پێ بکەن .وە باوەڕمان بە هەموو ئەو پێغەمبەرانە (علیهم

السلام) هەیە کەوا خوای گەورە ناردوویانیەتی بۆ نەتەوەکانیان، وە باسی بیست وپێنج دانەیانی کردوون لە قورئانی پیرۆز ، وە خوای گەورە هەواڵی داوە کەوا بۆ هەموو ئومەتێك پێغەمبەرێکی ناردوە بە یەکخواناسین، وە هیچ ئومەتێك نیە لە ئومەتەکان ئیلا ترسێنەرێکی بۆ ناردوون.

خوای گەروە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ بِالْحَقِّ بَشِيراً وَنَذِيراً ۚ وَإِنْ مِنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ﴾[1]

واتە: بێگومان ئێمە تۆمان بە (ئاینی) ڕاست ناردووە مژدە دەرو ترسێنەر بیت هەر گەل و ئوممەتێك (پێغەمبەرێکی) ترسێنەری تێدا هاتووە

وە باوەڕمان بە ڕۆژی دواییە، ڕۆژی پاداشت وسزا ولێپرسینەوە، ڕۆژی هەستانەوەی خەڵکی لە گۆڕەکانیانەوە بۆ لای پەروەردگاری جیهانیان، ئەو ڕۆژەی کە ئەم زەوی یە دەگۆڕدرێ بە زەوییەکی تر وئاسمانەکانیش دەگۆڕدرێن بە

[1] الفاطر (٢٤)

ئاسمانی تر(، پاشان هەموو )لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە ودەردەکەون بۆ لای خوای تەنیای زاڵ بەسەر هەموو شتێکدا. ئەوەی کردەوەکانی چاك بوبێت لە دونایادا ئەوە لەگەڵ کەسانێکن کە خوا بەهرەی ڕشتووە بەسەریاندا لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان وشەهیدان وپیاوچاکان، وە ئەوانە چ هاوڕێ و هاوەڵێکی چاکن.

وەئەوەی لاپەڕەی کردەوەکانی پڕ بێت لەهاوبەش پەیداکردن وگوناح وتاوان، ئەوانە تەرازوەکەیان سوکە ولەگەڵ هاوری خراپ وسەرکردە گومڕاکان دان لە ناو ئاگری دۆزەخ کە زۆر گەرمەو زۆر قوڵە وپڕە لە کۆت و زنجیرە، هاوار دەکات وەڵام نادرێتەوە وداوای یارمەتی دەکات بەڵام کەس نیە یارمەتی بدات

وە باوەڕمان وایە کە خوای گەورە زانایە بە هەموو کاروباری بونەوەر وکردەوەی بەنداکان پێش ئەوەی روبدات، وە خوای گەورە هەمووی نوسیوەتەوە بەو شێوەیەی کە زانیویەتی، وە ویستی خوای گەورە وا بووە کە رووبدات، چونکە ژیانی

دونیای کردوە بە جێیگای تاقیکردنەوە و ئیبتەلا کردن، وە هیچ شتێك ڕوونادات لە مولکی خوای گەورە کە ویستی لەسەر نەبێت.وە باوەڕمان وایە کە خوای گەورە بەندە وکردەوەکانیانی دروست کردوە و وەدروستکەری هەموو شتێکە، وە چاودێرە بەسەر هەموو شتێکەوە.

وە هەر شتێك بەسەر بەندەکان بێت لە موسیبەت و غەم وناخۆشی، ئەوە خوای گەورە نوسیویەتی، وە تووشی هیچ شتێك نابین بێجگە لەوەی کە خوای گەورە نوسیویەتی بۆمان وتەقدیری کردوە بە هۆی کردەوەکەیەوە، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَمَا أَصَابَكُمْ مِنْ مُصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَنْ كَثِيرٍ﴾[18]

واتە: وە هەر ناخۆشییەکتان تووش بووبێ ئەوە بەهۆی کردەوەی (خراپی) خۆتانەوەیە وە لە زۆرێکیش چاوپۆشی کردووە.

دەبێت بەندە ڕازی بێت بە قەدەر، وەهەوڵ بدات ئیشی چاکە ئەنجام بدات، وە ڕازی نەبوون بە موسیبەت، ئەوە

[1] الشورى (٣٠)

موسیبەتەکە لانابات و نایگەڕێنێتەوە وپاداشتەکەشی لە دەست دەدات، هەر وەک چۆن وتراوە: ئەگەر ئارامی بگریت ئەوە قەدەر بەسەرتا دەروات وپاداشت دەدرێتەوە، وە ئەگەر ئارامیش نەگریت ئەوە قەدەر بەسەرتا دەروات و گوناح باریش دەبیت.

وە لەگەڵ باوەڕ هێنان بە هەموو ئەوەی کە باسمان کرد، دەبێت کاروکردەوەی چاك ڕاستی ئەوە دەربخات. چونکە باوەڕ بریتیە لە ئۆقرە گرتن لە دڵدا ووتنی شایەتومان بەزومان، وکارپێکردنی بە ئەندامەکانی جەستــە و لەش .وە باوەڕ زیاد دەکات بە گوێڕایەلی وتاعەت، وە کەم دەکات بە سەرپێچی وتاوان، وە ئەوەی نوێژ نەکات ئەوە باوەڕی نیە لە لای زۆرێك لە زانایان. ئەمە بە کورتی باسی ئیمانمان کرد و بە شێوەیەکی کورت و پوخت و بۆمان کردن بە بەش بەش تاکە بە باشی بزانین ئیمان و باوەر چیە و ئیمانیش بنچینەکانی چیە .

## شوێنکاری لاوازی ئیمان

1- کەوتنە ناو تاوان و کردنی ئەو کارانەی کە حەرامن.
ئەنجامدانی تاوانی بچوك بە شێوەیەکی زۆر ئەبێتە هۆی ئەوەی کە رابێت لەسەر ئەو کردارانە و شرین بێت لە دڵدا وە پێغەمبەری خودا ( ﷺ )دەفەرموێت: ((إِنَّ الْمُؤْمِنَ إِذَا أَذْنَبَ ذَنْبًا كَانَتْ نُكْتَةً سَوْدَاءَ فِي قَلْبِهِ ، فَإِنْ تَابَ وَنَزَعَ وَاسْتَغْفَرَ صُقِلَ قَلْبُهُ ، فَإِنْ زَادَ زَادَتْ ، فَذَلِكَ الرَّانُ الَّذِي ذَكَرَهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ ، فِي كِتَابِهِ: كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ[١٩] ))
واتە:هەر ئیمانداریك تاوان بکات و ئەوە لەسەر دڵی خاڵێکی رەش پەیدا دەبێت ، ئەگەر تەوبە بکات و بپارێتەوە لە خودا ئەوە دڵی پاك دەکاتەوە ، وەئەگەر تاوان زیاتر بکات دیارە خاڵی رەشەکان لەسەر دڵی زیاد دەبێت و دەبێتە هۆی ژەنگاوی بوونی دڵ.

---

[1] المطففين (١٥)

2- هەست کردن بە دڵ تەنگی و بێ تاقەتی بوون و دوور کەوتنەوە لە خودای گەورە ، خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّن بَعْدِ ذَلِكَ فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً وَإِنَّ مِنَ الْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الأَنْهَارُ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ الْمَاء وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللّهِ وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ [٢٠]﴾

واتە : لەپاشان دڵتان رەق بوو پاش ئەم هەموو موعجیزانە دڵتان وەك بەردە بەڵكو زۆر رەقترە بەراستی بەردی وا هەیە لەچەند لاوە جۆگە ئاوی لێ هەڵدەقوڵێ وە بێگومان هی وایان هەیە کەلەت دەبێ ئاوی لێدێتە دەرەوە وە بەراستی هی وایان هەیە لە ترسی خوا بەر ئەبێتەوە وە خوا بێ ئاگا نیە لەوەی کە دەیکەن.

٣- تەمبەڵی کردن لە بەندایەتی کردندا تا رادەیەك کەوا واز لە نویژە سوونەتەکان بێنیت وەك شەو نوێژ ونوێژی خۆر گیران و مانگ گیران و نوێژی دوای فەرزەکان

[2] البقرة (٧٤)

٤- دوورکەتنەوە لە خوێندنەوەی قورئان بە جۆرێك حەز بە گوێگرتنی قورئان دەکات بەڵام نەفس رێگەی نادات بیخوێنیتەوە ، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ[٢١] ﴾
واتە : ئاخۆ ئەوانە وورد نابنەوە لە قورئان ( تێی ناگەن ) ، وانیە بەڵکو دڵیان قفلی لێ دراوە . خوای گەورە پەنامان بدات.

٥- بێ ئاگا بوون لە یادی خوا بە رادەیەك زۆر گران بێت لەسەر شانی یادکردنی خوای گەورە ، ئەمەش سیفەتێکە خوای گەورە دەیداتە پاڵ دووروەکان هەر وەکە چۆن خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوا إِلَى الصَّلَاةِ قَامُوا كُسَالَىٰ يُرَاءُونَ النَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا [٢٢]﴾ واتە : بەراستی دووروەکان دەیانەوێت خوا هەڵخەڵەتێنن کەچی خوا خەڵتێنەری ئەوانە(لە پاداشتی سزاکەیان) هەر کاتێکیش هەستن بۆ نوێژ بە تەمەڵی و سستی هەڵدەستن روپامایی بۆ خەڵك ئەکەن وە یادی خوا ناکەن کەمێك نەبێت

[2] سورة محمد (٢٤)
[2] سورة النساء (١٤٢)

وەهەر کەسێك پشت هەڵبکا لە یاد و بەرنامەی خودای گەورە توشی ژیانێکی تاریکی و نارەحەت دەبێت لە دونیا و قیامەت دا هەر وەکو چۆن خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى ﴾[23]

واتە : هەر کەسێك پشت لە ڕێباز و پەیامی من بکات ئەوا ژیانێکی تەنگی دەبێت ولە قیامەتدا بە کوێری حەشری دەکەین

٦- تووره نەبوون لەکاتێکدا کە دەست درێژی بکرێتە سەر ئەو سنورەی کە خوای پەروەدگار دایناوە ، چونکە غیرەت لەناو دڵدا نامێنێت ، وە هەرکەسێك غیرەتی ناو دڵیدا نەما ئەوا ئاینەکەشی لاواز دەبێت، هەروەها نە فەرمان بە چاکە دەکات وە نە ڕێگەش لە خراپە دەگرێت ، هەموو ئیشەکانی لەلای یەکسان بووە ، ئەم سەفەتانەش پێچەوانەی فەرمودەی خوایە (ﷺ) کە دەفەرمووێ: ((من رأى منكم منكرا فليغيره بيده ، فإن لم يستطع فبلسانه ، فإن لم يستطع فبقلبه ، وذلك أضعف الإيمان[24] ))

---

[2] سورة طه (١٢٤)

[2] رواه بخاري ١/٥١

واتە : هەر یەکێك لە ئێوە کارێکی خراپی بینی با هەوڵبدات بەدەست بیگۆڕێ وە ئەگەر نەیتوانی ئەوا بە زمانی وە ئەگەر نەیتوانی با بەدڵی پێی ناخۆش بێت ، ئەمەش نزمترین پلەی ئیمانە . خوا پەنامان بدات.

٧- بەغیلی و حەزنەکردن لەوەی کە ئاسۆی موسڵمانان دەرکەوێت

٨- پێچەوانە بوونی کردار لەگەڵ گوفتار ئەو کەسەش کە کرداری پێچەوانن گوفاترەکەیەی بێت زەم کراو ئەبێت لەلای پەروەدگار و لەناو خەڵکی دا بێزراو دەبێت ، پەروەدگار لەم بارەیەوە پێمان دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ [25]﴾

واتە : ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە بۆچی ئەوەی ئەیڵێن ئەنجامی نادەن.

٩- هەست نەکردن بە ناخۆشی کاتێك برا موسوڵمانەکان کارەکانیان سەرنەگرێت و زەرەر و زیانیان بەرکەوێت یاخود موسیبەتێکیان بەسەردا دێت.

١٠- رق لێ بوونەوە لە کاری چاکە و گوێ نەدان بە ئیشێ چاکەی بچوك ، بیر لەوە ناکاتەوە کە لەوانەیە کارێکی کەم

---

[2] سورة الصف (٣)

ببێتە هۆی لێخۆشبوونی تاوانەکانی هەروەك چۆن پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ((لا تحقـرن مـن المعروف شيئاً ولو أن تفرغ من دلوك في إناء المستقي ، ولو أن تكلـم أخاك ووجهك إليه منبسطا[٢٦] ))

١١ - گرینگی نەدان بە کاروباری موسوڵمانان نە بە دوعاکردن و نە بە بەخشین و یارمەتی ، نەبە پشت گیری کردن ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ )دەفەرموێ: ((إن المؤمن من أهل الإيمان بمنزلـة الرأس من الجسد، يألم المؤمن لأهل الإيمان كما يألم الجسـد لمـا فـي الرأس[٢٧] ))

١٢ - هەست بە لێپرسیاری نەکردن بە کاری ئاینی و هەوڵ نەدانی بۆ بڵاوکردنەوەی یارمەتی نەدانی ئەو کەسانەش کە بەو کارە هەڵدەستن

١٣ - نەمانی بواری برایەتی نێوان موسڵماناندا چونکە ئەو تەنهاییەی کە مرۆڤ هەستی پێ دەکات لەئەنجامی زۆری تاوانەوەیە ، چونکە خوای پەروەدگار خۆشەویستی ئەو کەسەی کە تاوان و هەڵەدەکات دەریدێنی لە دڵی بەندەکەیدا

---

[2] منسن أحمد ٦٣/٥

[2] مسند أحمد ٥٠/٣٤٠

١٤- باوەشکردن بە دونیا بە رێژەیەکی وا ئەگەر شتێکی لە دەست بچیت وەك ماڵ و وەجاخ و پلە و پایە هەست بە ئازارێکی زۆر دەکات

١٥- دەمەقالێ کردنی زۆر بێ سوود پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: ((ما ضل قوم بعد هدى كانوا عليه إلا أتوا الجدل[٢٨]))

---

رواه أحمد فى منسند ٢٥٢/٥ [2]

## هۆکاری لاوازی ئیمان

لاوازی ئیمان چەند هۆکارێکی هەیە کە لەگەڵ دیاردەکەیدا یەك دەگرنەوە وەك کەوتنە ناو تاوان و خۆ خەریك کردن بە دونیاوە ، لێرەدا هەندێ لەو هۆکارانە دەخەینە روو:

١- دوور کەوتنەوە لە ژینگەیەکی ئیمانی بۆ ماوەیەکی زۆر ئەو کاتە ئەو کەشە لەدەست دەدەیت کە دڵ لەوێوەهێز وخۆراکی وەردەگرت، هەروەک خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ يَأۡنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخۡشَعَ قُلُوبُهُمۡ لِذِكۡرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلۡحَقِّ وَلَا يَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلُ فَطَالَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَمَدُ فَقَسَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَكَثِيرٌ مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ ٢٩﴾

واتە : ئایا وەختی ئەوە نەهاتووە بۆ برواداران ، کە دڵیان ملکەچی بێ بۆ ئامۆژگاری خوا و ئەو قورئانەی کە ناردویتە خوارەوە وەك ئەوکەسانەی( جولەکە و گاور ) مەبن کەلەمەو

---

[2] سورة الحديد (١٦)

پێش کتێبی ئاسمانیان پێ درا وە ماوەیەکی دووروو درێژیان بەسەردا تێپەری ئەوجا دڵیان ڕەق بوو ، زۆربەیان یاخی و لە سنووردەرچوون ،

٢-دوور کەوتنەوە لە پێشەنگی چاکەویست :ئەو کەسەی کە لەبەردەستی پیاو چاکێکدا زانستی بە سوود و کردەوەی چاك و هێزی باوەڕ پێکەوە گرێ دەدات ئەگەر ماوەیەك دوور کەوتەوە هەست بە ڕەقییەك دەکات لە دڵی دا .

٣- وازهێنان و دوور کەوتنەوە لە زانستی شەرعی : ئەوەی دڵوو دەروونی ئادەمیزاد ئەژێنێتەوە یەکەمجار قورئانی پیرۆزدا و پاشان فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) باشترین قسە و گوفتاری زانایان لە ئامۆژگاری و پەیوەندی بەسوود و هەروەها کە ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوڵانی دەخوێنێتەوە روو بە رووی دەزگاکانی باوەر دەبێتەوە

٤- بوونی مرۆڤ لە ناوەندێکدا کە تاوانی زۆری تیابکرێت یان تەنها باسی دونیای تیا بکرێت وەك کۆر و کۆبوونەکانی ئەمرۆ

٥- نوقوم بوون لە خۆخەریك كردن بە دونیاوە ، كاتێك وای لێدێت دڵ دەبێت بە بەندەی پارە و پوول ، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ((تعس عبد الدینار تعس عبد الـدرهم [30]))

٦- خۆخەریك كردن بە ژن و ماڵ و منداڵەوە ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞ وَأَنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ [31]﴾

واتە : وەبزانن بەراستی ماڵ و ، منداڵتان هۆی تاقیكردنەوەی (ئێوەن) وە بەراستی لای خوا پاداشتی زۆر گەورەی هەیە

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلۡبَنِينَ وَٱلۡقَنَٰطِيرِ ٱلۡمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلۡفِضَّةِ وَٱلۡخَيۡلِ ٱلۡمُسَوَّمَةِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ وَٱلۡحَرۡثِۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلۡمَـَٔابِ [32]﴾

واتە : ئەگەر ئەو خۆخەریك كردنە لە پێش گوێرایەڵی خواو پێغەمبەر بێت ئەوە بێزارو زەم كراوە بەڵام ئەگەر خۆشەویستی ژن و ماڵ و منداڵ لە رووە شەرعیەوە بەوە

---

[3] رواه بخاری (٢٧٣٠)

[3] سورة الأنفال (٢٨)

[3] سورة أل عمران (١٤)

بێت بە شێوەیەك کە هاوشان بێت لەگەڵ گوێڕایلی کردنی فەرمانی خودا ئەوا خاوەنەکەی سوپاسی کراوە ، وە هەندێکیش هەن رێك کەوتوون لەگەڵ ژن و ماڵ و منداڵەکانیانداو بە گوێڕایلی فەرمانی خوداوە

٧- هیوا درێژی: لە ( اثر ) دا هاتوە دەڵی : چوار کەس هەمیشە ماندوون و چاو بەستراون؛ دڵ رەقی و هیوا درێژی وە سوور بوون لەسەر کاروباری دونیا ، وە خوای پەروەدگار دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَـٰسِقُونَ [3] ﴾

واتە : ئایا ئیتر ئەوە نەهاتوە بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ، دڵەکانیان بە نوری ئیمان ملکەچ و روناك بۆوەتەوە . ترسی خوای تێدا بروانن بەهۆی یادی بەردەوامی خوا و ئەو قورئانەی کە رەوانەکراوە ، وەك ئەو کەسانەبن کە کتێبی ئاسمانیان بۆ رەوانە کرا ، دڵیان رەق و رەش بوو. زۆربەشیان یاخی و سەرکەش و نالەبار دەرچوون.

---

[3] سورة الحديد (١٦)

هەروەها وتراوە کە ئەو کەسەی هیوای کورت بێت خەم و خەفەتیشی کەم دەبێ وە دڵی رووناك دەبێ چونکە ئەگەر مردن هاتە پێشەوە لێی هەوڵی گوێرایەڵی دەدات

٨- زیادە رەوی کردن لە خواردن و خواردنەوە و خەوتن و قسەکردن  تێکەڵاوی کردن دا چونکە خواردنی زۆر دەبێتە هۆی زەین کوێری و ئەمەش رێگەی شەیتان خۆش دەکات وەک وتراوە: (ئەوەی زۆر بخوات زۆریش دەخواتەوە  وە زۆریش دەنوێت وە پاداشتی گەورە لە دەست  دەدات )

هەروەها زیادەڕەوی کردن لە قسەکردندا دڵ رەق دەکات وە زیادە رەوی کردن لە تێکەڵ بوونی خاڵك ئەبێتە هۆی ئەوەی کەم نەفسی پپرسێتەوە وە زۆر پێبکەنیت کە دەبێتە هۆی مردنی دڵ.

## چارەسەری لاوازی ئیمان

دڵی مرۆڤی باوەردار هەندێ جار هەورێکی رەش لە تاوان دایدەپۆشێت بەمەش دوور دەبێت لە ڕووناکی و لەتەنهایدا دەمێنێتەوە؛ وە لە خوارەوە بە پشتیوانی خوای گەورە هەندێ لەو هۆکارانە باس دەکەین کە بە هۆیەوە باوەردار ئەتوانێت دەروونی خۆی پێ ئامادە بکات لە بری ئەوەی پشت ببەستێ بە چارەسەرە دەرەکیەکان بۆ ئەوەی رەقی دڵ لابەرێت و چارەسەری لاوازی ئیمانەکەی پێ بکات لە دواى پشت بەستن بە پەروەدگار

١- وردبوونەوە لە قورئانی پیرۆز : ئەمەش بە بیرکردنەوی و ورردبونەوە دەبێ چارەسەرەکەی زۆر گەورەیە ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ وَلاَ يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إِلاَّ خَسَارًا ٣٤﴾

[3] سورة الأسراء (٨٢)

واتە : وە لەم قورئاندا دەنێرینە خوارەوە ئەوەی کە هۆی شیفا و میهرەبانی یە بۆ بڕواداران بەڵام ( ئەم قورئانە ) بۆستەم کاران هیچ زیادناکات جگەلە خەسارەتمەندی

٢- گەران بە دوای زانستی شەرعیدا ئەمەش هۆکارێکە بەهۆیەوە دەتوانین بگەییت بە ترسان لەخواو زیاد بوونی باوەر وەك چۆن پەروەدگار دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَٰلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ [3] ﴾

واتە: بەراستی لەناو بەندەکانی خودا تەنیا زانایان(وەك پێویست ) لە خودا دەترسن بێگومان خوا زاڵی لێبوردەیە

٣- پرکردنەوەی کاتەکان بە کاری چاکە و گۆرانکاری کردن لە بەندایەتی کردندا

٤- ترسان لە عاقیبەت شەر چونکە پاڵ بە موسوڵمانەوە دەنێت کە زیاتر گوێرایەل بێت بە تازە کردنەوەی ئیمان لە

---

[3] سورة الفاطر (٢٨)

دڵ و دەروونداا، بەڵام عاقیبەت شەری هۆکاری زۆرە لەوانە لاوازی ئیمان و نوقوم بوون لە تاواندا

٥- زۆر یادکردنی مردن ، هەروەك چۆن پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) (( وأكثرو اذكر هادم اللـذات يعـني المـوت [٣٦]))

وە چاکترین شت کە مردنمان یاد بهێنێتەوە سەردانی گۆڕستانە هەر وەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ((كنت نهيتكم عـن زيـارة القبـور ألا فزوروهـا فإنها تـذكركم الآخـرة[٣٧] ))

٦- بیرکردنەوە لە پلە و پایەکانی رۆژی دوایی ئەمەش لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر باس کراوە

٧-یاد کردنەووی خوای گەورە چونکە یادکردنەوی خوا هێمن کەرەوەی دڵە و روحی کردەوەی چاکە وە لە هەموو شتێکدا گەورەترە وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ اتْلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيْكَ

---

[3] رواه الترمذي (٢٣٠٧)

[3] رواه الحاكم ٣٧٦/١

مِنَ الْكِتَابِ وَأَقِمِ الصَّلاَةَ إِنَّ الصَّلاَةَ تَنْهَي عَنِ الْفَحْشَآءِ وَالْمُنكَرِ وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ [٣٨]﴾ واتە : بیخوێنەوە ئەو قورئانەی کە سرووش کراوە بۆت وە نوێژ بکە بێگومان نوێژ بەرگری (نویژکەر) دەکات لە کاری ناشرین و نا پەسەند (خراپە) وە زیکری یادی خوا گەورەترە ( لە هەموو شتێك ) خواش بەهەر کارێك کە دەیکەن دەزانێ تەنها بە یاد کردنەوەی پەروەدگار خوای گەورە رازی دەکات و شەیتان دەردەکات ، وە لا بەری خەم و خەفەتە وە هێنەری رزق و رۆزیەوە وە هۆیەکە بۆ کردنەوەی دەرگای زانست

٨- مناجات کردن لەگەڵ پەروەدگار و خۆ شکاندنەوە لە بەرامبەریدا : هەر چەندە بەندە زیاتر زەلیلی خۆی و ملکەچ کردنی خۆی دەربرێت زیاتر لە خواوە نزیك دەبێتەوە لەبەر ئەوە پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) (( أقرب ما يكون العبد من ربه وهو ساجد فأكثروا الدعاء[٣٩] ))

---

[3] سورة العنكبوت (٤٥)

[3] رواه مسلم ٤٨٢

هەروەها خۆ بە هەژار زانین بەرامبەر خوا ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ [٤٠] ﴾

واتە : ئەی خەڵکینە هەر ئێوە هەژاری لای خوان وە تەنیا خوایە بێ نیازی ستایشکارە

٩- هیوا کورتی ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَنْ لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا سَاعَةً مِنَ النَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِلِقَاءِ اللَّهِ وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ [٤١] ﴾

واتە : وە (بیریان خەرەوە) ئەو رۆژەی کە (خوا) هەموویان کۆ دەکاتەوە دەڵێن لە دنیادا نەماوینەتەوە ساتێکی کەم نەبێت لە رۆژ خۆیان بەیەکتر دەناسێنن بەراستی زەرەرمەند بوون ئەوانەی کە بڕوایان نەهێنا بە (زیندووبەنوەو) دیاری خوا وە ئەوانە رێنموون وەرگرنەبوون

---

[4] سورة الفاطر (١٥)

[4] سورة یونس (٤٥)

١٠- بە گەورە راگرتن سنورەکانی پەروەدگار ، خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ ذَٰلِكَ وَمَنْ يُعَظِّمْ شَعَائِرَ اللَّهِ فَإِنَّهَا مِنْ تَقْوَى الْقُلُوبِ[٤٢] ﴾

١١- خۆشەویستی باوەرداران و دوورکەوتنەوە لەبێ باوەران چونکە ئەگەر دەروون پەیوەست بوو بە دووژمنانی خواوە لاواز دەبێت و مانای بیر و باوەر ئەتوێتەوە و ئەگەر خۆشەویستی تەنها بۆ خوا بوو وە دوژمنانیش تەنها بۆ دوژمنانی خوا بێت ئیمان ئەژێنێتەوە

١٢- لێ پرسینەوە لە دەروون ، خوای گەورە دەفەرموێ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنْظُرْ نَفْسٌ مَا قَدَّمَتْ لِغَدٍ ۖ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۚ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ [٤٣]﴾

واتە : ئەی ئەوانەی کە باوەرتان هێناوە لەخوا بترسن وە هەموو کەسێك با سەرنج بدات ( بزانێ ) چی پێش خۆی ناردوە بۆ پاشەرۆژی وە لەخوا بترسن بەراستی خوا شارەزایە بەوەی کە دەیکەن

---

[٤] سورة الحج (٣٢)

[٤] سورة الحشر (١٨)

١٣- بچوك كردنەوەی دونیا هەتاوای لێ دێت پەیوەست بوون بە دونیاوە لا دەچێت لە دڵی بەندەدا

١٤- سادە و ساكاری : ئەم سیفەتە لە رەوشتی مرۆڤدا دەورێكی زۆر گەورەی هەیە لە تازەكردنەوی ئیماندا .

١٥- كرداری دڵەكان وەك خۆشەویستی و لە خواترسان وپارانەوە لێی وگومانی باش بردن پیی و پشت بەستن پێی و رازی بوون لێی وباوەڕبوون بەو قەزا و قەدەرانەی كە دێتە رێگەوە ، سوپاس كردنی و راست گوێی لەگەڵیدا و دڵنیابوون پێی وە باوەڕ هێنانیان پێی

١٦- پارانەوە لە خوای گەورە ئەمەش بەهێزترین هۆكارە كە بەندە دەتوانێت بیكات

١٧- كارلێك كردن لەگەڵ بەڵگە گەردوونیەكان و تێڕمانان لە دروستكراوەكانی خوای كردگار .

## بەهەشت

سەرەتا بۆیە باسی بەهەشت دەکەین لەگەڵ ئەم دوو بابەتەی پێشوو تر تاوەکو بزانین ئێمە بەهۆی چیەوە گوناح دەکەین ئەی بۆ ئەو شوێنە خۆشەمان لە بیر کردووە کە ناوی بەهەشتە (الجنة) بەراستی ئەگەر لەخوا بترسین و لاوازی ئیمان لە دڵمان نەمێنێ ئەوا بەهەشت بۆ خۆمان مسۆگەر دەکەین . ان شاءلله لەم پەڕانەی داهاتوو باسی خۆشیەکانی بەهەشت و ئەو شتانەی کە لە بەهەشتدا هەیە بکەین . ،بەراستی ستەمە ئێمە هەڵدەستین ئەم بەهەشتە دەگۆرینەوە بە دونیا بەهۆی تاوان و نەترسان لەخوا و لاوازی ئیمانمان بۆیە با لە ئێستاوە هەستین تەوبە بکەین و واز لەو گوناحانە بینین کە دەیکەین چ بچوك بێت چ گەورە بێت ، ان شاء الله خوای گەورە هەموومان بە بەهەشتی بەرین شاد دەکات

## بەهەشت لەچی دروست کراوە

عن أبی هريرة قلنا : الجنة ما بناؤها ؟ قال :((الْجَنَّةُ بِنَاؤُهَا لَبِنَةٌ مِنْ فِضَّة وَلَبِنَةٌ مِنْ ذَهَبٍ وَمِلَاطُهَا الْمِسْكُ الْأَذْفَرُ وَحَصْبَاؤُهَا اللُّؤْلُؤُ وَالْيَاقُوتُ وَتُرْبَتُهَا الزَّعْفَرَانُ مَنْ دَخَلَهَا يَنْعَمُ لَا يَبْأَسُ وَيَخْلُدُ لَا يَمُوتُ لَا تَبْلَى ثِيَابُهُمْ وَلَا يَفْنَى شَبَابُهُمْ[٤٤]))

واتە : بەهەشت پێکهاتووە لە خشتێکی زیو و خشتێکی زێڕ، وە قوری ( نێوان خشتەکان ) میسکە ، وە زیخەکەی مرواری و یاقوتە ، وە خاکەکەی زەعفەرانە ، هەر کەسێك بچێتە ناوی لە نازی نیعمەتدا دەژیت و توشی عەزاب نابێت وە بۆ هەتا هەتایە دەمێنێتەوە و نامرێت ، جلەکانیان کۆن و رزی نابن ، وە گەنجێتیان لەناو ناچێ.

---

[٤٤] رواه الترمذی

## رەشماڵێکی مرواری بۆ ئیماندارارن

عن أبی بکر بن عبدالله بن قیس عن ابیه عن النبی (ﷺ) قال : ((إن للمؤمن في الجنة لخیمة من لؤلؤة واحدة مجوفة، طولها ستون میلاً ،للمؤمن فیها أهلون، یطوف علیهم المؤمن، فلا یری بعضهم بعضا[٤٥] ))

واتە : بێگومان بۆ بروادارارن هەیە لەبەهەشت رەشماڵێك لەیەك دەنکە مرواری ناو پۆش پێك دێت ، درێژیەکەی شەست میلە . کە کۆمەڵە خێزانی بروادار بەسەریان دا دەسورێنەوە کەسیان کەسی تر نابینین.

---

[4] رواه ابو مسوی (١٤٦٥)

## بەهەشت هەشت دەرگای هەیە

خوای گەورە دەفەرموێ:﴿وَسِيقَ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ إِلَى الْجَنَّةِ زُمَرًا حَتَّى إِذَا جَاءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَامٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ[٤٦]﴾

واتە : وە کەسانێ کە لە پەروەدگاریان دەترسان دەبرێن بۆ بەهەشت پۆل پۆل تا کاتێ دێنە نزیکی بەهەشت و دەرگاکانی دەکرێنەوە ، وە دەرگاوانەکانی بەوان دەڵین سەلامتان لێبێت ئێوە پاك و خاوێن بوون ، کەواتە برۆنە ناو بەهەشت بە هەمیشەیی و بۆ هەتا هەتایە

عن سهل بن سعد عن النبی (ﷺ) قال : ((في الجنة ثمانية أبواب فيها باب يسمى الريان لا يدخله إلا الصائمون[٤٧]))

واتە : لەبەهەشت هەشت دەرگا هەیە ، دەرگایەکی تێدایە

---

[٤] سورة الزمر (٧٣)

[٤]رواه البخاری (٣٢٦٧)

ناوی رەییانە کە تێیدا بەو دەرگایە بێجگەلە رۆژووەوان کەسی تر ناچێتە بەهەشت عن ابی هريرة ان رسولالله(ﷺ)قال:
((من أنفق زوجين في سبيل الله نودي في الجنة يا
عبد الله هذا خير فمن كان من أهل الصلاة دعي من باب الصلاة ومن كان من أهل الجهاد دعي من باب الجهاد ومن كان من أهل الصدقة دعي من باب الصدقة ومن كان من أهل الصيام دعي من باب الريان قال أبو بكر الصديق يا رسول الله ما على أحد يدعى من تلك الأبواب من ضرورة فهل يدعى أحد من تلك الأبواب كلها قال رسول الله صلى الله عليه وسلم نعم وأرجو أن تكون منهم))[٤٨]

واتە : هەر کەسێك جوتێك دوو شت ببەخشێت لە رێی خوادا ( وەك دوو مەر دوو بزن دوو دوو فەردە شەکر ..... ) لەهەموو دەرگاکانی بەهەشت بانگ دەکرێ ( دەرگاوانی بەهەشت بانگی دەکەن و دەڵین ) ئەی بەندەی خودا ئەم

[4] رواه بخاری (١٨٩٧) رواه مسلم (١٠٢٧)

دەرگایە باشە ( وەرە لێرە بچۆ ژوورەوە ) جا ئەوەی خاوەنی نوێژە لە دەرگای نوێژەوە بانگ دەکرێ وە ئەوەی ئەهلی جیهادە لە دەرگای جیهاد بانگ دەکرێ وە ئەوەی ئەهلی رۆژوە لە دەرگای رەییانەوە بانگ دەکرێ وە ئەوەی ئەهلی خێر و سەدەقە بێت لە دەرگای خێر و سەدەقە بانگ دەکرێ ، ئەبو بەکر(رەزای خوای لێبێت) دەڵی ( ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کەس هەیە لەهەموو دەرگاکان بانگ بکرێ ؟ ) ، پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) ئومێد دەکەم تۆ یەکێك بیت کە لەهەر هەشت دەرگایەکە بانگ بکرێی

## لەبەهەشت سەت پلە هەیە

عن ابی هریرة قال : قال رسول الله(ﷺ) ((في الجنة مائة درجة ما بين كل درجتين مائة عام [٤٩]))

واتە : بەهەشت سەت پلەیە و نێوان هەر پلەیەك سەت ساڵە رێیە

---

[٤] رواه الترمذی ( ٢٥٢٩ )

## فیردەوس بەرزترین شوێنە

عن عباد بن صامت ان رسول الله (ﷺ) قال :((فإن في الجنة مائة درجة ما بين كل درجتين كما بين السماء والأرض والفردوس أعلى الجنة وأوسطها وفوق ذلك عرش الرحمن ومنها تفجر أنهار الجنة فإذا سألتم الله فسلوه الفردوس[٥٠]))

واتە : لەبەهەشت سەت پلە هەیە و نێوانی هەر پلەیەك وەكو زەوی و ئاسمان دایە وە فیردەوس بەرترین پلەیە وە هەر لەوێش هەر چوار رووبارەكەی بەهەشت هەڵدەقوڵێن وە لە سەرووی فیردەوس عەرشی خوایە جا ئەگەر داواتان لە خوای گەورە كرد داوای فیردەوسی لێ بكەن.

عن العرياض بن سارية قال : قال رسول الله (ﷺ) ان سالتهم الله فسلوه الفردوس فانه اعلى الجنة[٥١]

---

[5] رواه الترمذى (٢٦٣١)

[5] رواه البزار

واتە : ئەگەر داواتان لەخودای گەورە کرد داوای فیردەوسی لێبکەن چونکە بەرزترین شوێنە لە بەهەشت

ئەوانەی دەچنە بەهەشت داوای شوێنی تر ناکەن

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلًا (١٠٧) خَالِدِينَ فِيهَا لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا (١٠٨)﴾[٥٣]

واتە : بەراستی ئەوانە کە ئیمان و باوەریان هێناو وە کردەوە چاکەکانیان کردووە بەهەشتەکانی فیردەوس جێگای (میوانداری) ئەاوانە ، بەبەردەوامی تیایدا دەمێنێتەوە داوای گواستنەوە ناکەن لەو ( بەهەشتە )

[5] سورة الكهف (١٠٧-١٠٨)

## بەهەشت ئەوەی دڵ حەزی لێبی تیایەتی

خوای گەورە دەفەرموێ:﴿يُطَافُ عَلَيْهِمْ بِصِحَافٍ مِنْ ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الْأَنْفُسُ وَتَلَذُّ الْأَعْيُنُ وَأَنْتُمْ فِيهَا خَالِدُونَ[٥٣]﴾

واتە: بەسینی و پەرداغی ئاڵتونی (خواردن و خواردنەوە) دەگێرن بەسەریاندا ، وە لەو بەهەشتەدا ئەوەی دڵ حەزی لێ بێت تیایەتی چاو خۆشی و لەزەتی پێ بگات بە بینینی وە ئێوە بە هەتا هەتایی دەمێنێتەوە تیایادا .

عن أبو أيوب قال : اتى اعرابى النبى(ﷺ) ،فقال : إني أحب الخيل ، أفي الجنة خيل ؟ قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : ((إن أدخلت الجنة أتيت بفرس من ياقوتة له جناحان ، فحملت عليه ، ثم طار بك حيث شئت[٥٤]))

---

[5] سورة الزخرف (٧١)

[5] سلسلة الصحيحة (٣٠٠١)

واتە : کابرایەکی دەشتەکی هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) و گوتی : من حەزم لە ئەسپە ئایا بەهەشت ئەسپی تێدایە ؟ وەڵامی دایەوە و فەرموی (ﷺ) :ئەگەر چویە بەهەشت ئەسپێکت پێ دەدرێ لە یاقووت دوو باڵی هەیە ، سواری ئەم ئەسپە دەکرێی جا دەتفرێنێ لە ناو بەهەشت بۆ هەر کوێیەك بتەوێ و ئارەزووی بکەی .

## بەهەشتیەکان ٣٣ ساڵن

عن ابی هریرة قال : قال رسول الله (ﷺ): (( يَدْخُلُ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ جُرْدًا، مُرْدًا، بِيضًا، جِعَادًا، مُكَحَّلِينَ، أَبْنَاءَ ثَلَاثٍ وَثَلَاثِينَ، عَلَى خَلْقِ آدَمَ، سِتُّونَ ذِرَاعًا فِي عَرْضِ سَبْعِ أَذْرُعٍ [٥٥]))

واتە : خەڵکی بەهەشت کە دەرۆنە بەهەشت تەمەنیان ٣٣ ساڵە ، بێ موو و بێ ردێنن ، سپینە ، پرچیان لوولە چاو جوان و کل رێژن .لەسەر شێوەی ئادەمن (رەزای خوای لێبێت) شێست باسك درێژن بە پانی حەوت باسك( بە ژن و پیاو تەمەنیان ٣٣ ساڵە

[٥] رواه الطبراني و أحمد

## بەهەشتیەکان بێ موو و ردێنن

عن ابی هریرة قال : قال رسول الله (ﷺ) : ((أهل الجنة جُرد مُرد كُحل، لا يفنى شبابهم ولا تبلى ثيابهم[٥٦]))

واتە : خەڵکی بەهەشت لەشیان بێ موو و ریشیان نیە چاو بەکلن گەنجێتیان لەناو ناچێ و پۆشاکشیان رزی و کۆن نابێت

## خەوتن نیە لە بەهەشت

عن جابر قال : سئل نبی اللله(ﷺ) أينام أهل الجنة؟ قال(( لا النوم أخو الموت، وأهل الجنة لا يموتون ولا ينامون[٥٧]))

واتە : پرسیار لە پێغەمبەر(ﷺ) کرا وتیان ئەهلی بەهەشت ئەخەون ؟ وەڵامی داوە وتی خەوتن برای مردنە خەڵکی بەهشت ناخەون

[٥] رواه الترمذی (٢٥٣٩)

[٥] رواه الطبرانی (١٠٧٨)

## مردن نیه لەبەهەشت

عن ابن عمر قال : قال رسولل الله (ﷺ) : ((اذَا صَارَ أَهْلُ الْجَنَّةِ إِلَى الْجَنَّةِ وَأَهْلُ النَّارِ إِلَى النَّارِ جِيءَ بِالْمَوْتِ حَتَّى يُجْعَلَ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ ثُمَّ يُذْبَحُ ثُمَّ يُنَادِي مُنَادٍ يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ لَا مَوْتَ وَيَا أَهْلَ النَّارِ لَا مَوْتَ ، فَيَزْدَادُ أَهْلُ الْجَنَّةِ فَرَحًا إِلَى فَرَحِهِمْ وَيَزْدَادُ أَهْلُ النَّارِ حُزْنًا إِلَى حُزْنِهِمْ[٥٨]))

واتە : کاتێك کە بەهشتیەکان چونە بەهەشت و دۆزەخیەکان چونە دۆزەخ ،مردن دەهێنرێت هەتا دەخرێێتە نێوان بەهەشت و دۆزەخ لە پاشان سەردبردرێت ، لەپاشان بانگ دەرێك بانگ دەدات ، دەڵێ ئەی خەڵکی بەهەشت مردن نەما وە ئەی خەڵکی دۆزەخ مردن نەما جا بەهەشتیەکان خۆشیەکانتان زیاد دەبێت و دۆزەخیەکان خەم خەم زیاتر دەبێت

[٥] رواه البخاری (٦٥٤٨)

خودای گەورە دەفەرموێ:﴿ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا الْمَوْتَ إِلَّا الْمَوْتَةَ الْأُولَىٰ وَوَقَاهُمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ [5]﴾

واتە : بێجگەلە مردنی یەکەم ( مردنی دونیا ) ئیتر مردنی تیادا ناچێژن ( لەبەهەشت )

وەهەروەها خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُولَٰئِكَ هُمْ خَيْرُ الْبَرِيَّةِ (٧) جَزَاؤُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ رَبَّهُ [6]﴾

واتە : بێگومان ئەوانەی بروایان هێناوەو کردەوەی باشیان ئەنجامداوە هەر ئەوان چاکتری هەموو درووست کراوەکانی خودان (٧) ، پاداشتی ئەوان لای خودای گەورە چەند بەهەشتێکە کە شوێنی نیشتەجێبوون و مانەوەن و جۆگەی ئاوی زۆر بە ژێریان ئەروات ئەمێنێتەوە لەو بەهەشتەدا بە

[5] سورة الدخان (٥٦)

[6] سورة البينية (٧-٨)

ئێجگاری هەتا هەتایەو بێ دوا هاتن برانەوە، خوا لەوانە رازی دەبێت  و ئەوانیش لە خوای خۆیان رازی دەبن ئەو پاداشتە و بەهرەیە بۆ کەسێکە کە ترسا بێ لە خوای گەورە

## بینینی خودا لەبەهەشت

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ (٢٢) إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ [٦١]﴾

واتە : زۆر روخسار لەو رۆژە گەشاوەن (٢٢) تەمەشای پەروەدگاریان دەکەن

وە خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌ  أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ [٦٢] ﴾

---

[6] سورة القيامة (٢٢-٢٣)

[6] سورة اليونس (٢٦)

واتە :بۆ ئەوانەی چاکەیان کردوە پاداشتی چاکتر (بەهەشت) و زیاتریان هەیە ( بینینی خودا ) دەم و چاویان لێ ناگیرێ بە هیچ رەشی و تەپ و تۆز و ریسوایەك ئەوانە هاورێ ی بەهەشتن ئەوانە لەو ( بەهەشتە ) دان بە هەمیشەیی

عن صهیب عن النبی (ﷺ) قال : (( إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ ، قَالَ : يَقُولُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى : تُرِيدُونَ شَيْئًا أَزِيدُكُمْ ؟ فَيَقُولُونَ : أَلَمْ تُبَيِّضْ وُجُوهَنَا ، أَلَمْ تُدْخِلْنَا الْجَنَّةَ ، وَتُنَجِّنَا مِنَ النَّارِ ؟ قَالَ : فَيَكْشِفُ الْحِجَابَ ، فَمَا أُعْطُوا شَيْئًا أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنَ النَّظَرِ إِلَى رَبِّهِمْ عَزَّ وَجَلَّ [٦٣] ))

واتە :کاتێك ئەهلی بەهەشت جونە بەهەشت خودای گەورە دەفەرموی شتێکی ترتان دەوی هەتا بۆتانی زیاد بکام ؟ جا ئەوانیش دەڵێن ئایا رووت سپی نەکردین ؟ ئایا نەت خستینە بەهەشت ؟ وە لە ئاگر رزگارت نەکردوین ؟ جا خودای گەورە پەردە لادەبات بەهەشتیەکان هیچ شتێکیان پێ نەدراوە خۆشەویستر بێت لەلایان لە تەمەشا کردن بۆ پەروەدگاریان

---

[٦] رواه مسلم (١٨١)

## بەئومێدی شادبوون بە خودای گەورە ئەمە بکە

عن جرير بن عبدالله قال :كنا جلوسا عند رسول الله صلى الله عليه وسلم إذ نظر إلى القمر ليلة البدر فقال:(( أما إنكم سترون ربكم كما ترون هذا القمر لا تضامون في رؤيته فإن استطعتم أن لا تغلبوا على صلاة قبل طلوع الشمس وقبل غروبها يعني العصر والفجر ثم قرأ جرير ( وسبح بحمد ربك قبل طلوع الشمس وقبل غروبها [٦٤]))

واتە : جەریری کوری عبدالله دەڵی : ئێمە لەلای پێغەمبەر دانیشتبوین (ﷺ) تەماشای مانگی چواردەی کرد و وتی : چۆن ئێستا ئەو مانگە چواردەیە دەبینن بێ گومان ئەوها پەروەدگارتان دەبینن لەبینینیدا تووشی هیچ زەحمەتەك نابن ( دەی بە ئومێدی شادبوون بە بینینی پەروەدگارتان ) تا دەتوانن ئاگەداری نوێژی بەیانی و عەسرتان بن و مەیان

[6] رواه بخاری (٥٥٤) و رواه مسلم (٦٣٣)

فەوتێنن . ئینجا جەرجیر ئەم ئایەتەی خوێندەوە وسبح بحمد ربك قبل طلوع الشمس وقبل غروبها[٦٥]

## لەبەهەشت شتی واهەیە بەخەیاڵی مرۆڤدا نەهاتووە

عن ابی هريرة قال : قال رسول الله (ﷺ) :(( قال الله عز وجل: أعددت لعبادي الصالحين ما لا عين رأت، ولا أذن سمعت، ولا خطر على قلب بشر. مصداق ذلك في كتاب الله (فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ [٦٦]))

واتە : پێغەمبەر دەفەرموێ(ﷺ):خودای گەورە فەرموویەتی : دامناوە بۆ بەندە چاکەکانم نەچاو بینیویەتی وە نەگوێ گوێبیستی بووە وە بە دڵی هیچ ئادەمیزادەکیش دا نەهاتوە ،

---

[٦٥] سورة ق (٢٩)

[٦٦] رواه البخاری (٣٢٤٤)

جا بیخوێنەوە ئەگەر حەز دەکەن ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ [٦٧]﴾

واتە : هیچ کەس نازانێ ئەوەی بۆیان شاردراوەتەوە لەوەی چاو پێی خۆش دەبێت لەپاداشتی ئەوەی ئەنجامیان داوە

## جیاوازی شوێنی بەهەشتیەکان

عن ابی سعد الخدری عن النبی (ﷺ) قال :((إن أهل الجنة ليتراءون أهل الغرف من فوقهم كما تتراءون الكوكب الدري الغابر من الأفق من المشرق أو المغرب لتفاضل ما بينهم))، قالوا يا رسول الله تلك منازل الأنبياء لا يبلغها غيرهم، قال:(( بلى والذي نفسي بيده رجال آمنوا بالله وصدقوا المرسلين[٦٨]))

واتە : بێگومان خەڵکی بەهەشت خەڵکی ناو باڵەخانەکان دەبینن لە سەروویانە هەروەکو چۆن ئێوە ئەو ئەستێرە زۆر

[٦٧] سورة السجدة (١٧)

[٦٨] رواه البخارى (٣٢٥٦) و رواه المسلم (٢٨٣١)

گەشاوانە دەبینن کە دوور کەوتونەتەوە لەکەناری ئاسمان نزیك بۆتەوە لە رۆژهەڵات یا لە رۆژئاوا خەریکن ئاوا دەبن . ئەو بەرزی و نزمیەش لەبەر جیاوازی پلەو پایەی نێوانیانە . گوتیان ئەی پێغەمبەر خودا ئەوە شوێنی پێغەمبەرەکانن بێجگەلە لەوان کەسی تری پێیان ناگات؟ فەرمووی : وانیە سوێند بەو زاتەی کە گیانی محمد (ﷺ)ی بەدەستە ئەوانە پیاوانێکن باوەریان هێناوە بە خواو نێردراوەکانی خۆشیان بەراست زانیوە

## لەبەهەشت منالّی ئیماندار
## بە دایك و باوكی ئیماندار دەگات

خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَاتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُمْ بِإِيمَانٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَا أَلَتْنَاهُمْ مِنْ عَمَلِهِمْ مِنْ شَيْءٍ كُلُّ امْرِئٍ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ [٦٩]﴾

واتە : وە ئەوانەی بروایان هێناوە وە رۆڵە و نەوەكانیان شوێنیان كەووتون لە ئیمان و باوەردا نەوەكانیان دەگەیەنین پێیان (لەبەهەشت دا) وە هیچ شتێ كەم ناكەینەوە لە كردەوە چاكەكانی باوك و دایكە ئیماندارەكە هەموو كەسێ بەستراوە بە بەند كراوەی بە كردەوەی خۆی

ابن عباس دەڵێ ( خودا منداڵی ئیمان دار بەرز دەكاتەوە بۆ پلەی ئەو هەرچەندە منداڵەكە لە پلەی نزم تر بێت لە دایك و باوكی ئەمەش بۆ ئەوەیە كە چاویان گەشتر بێت )

---

[٥] سورة الطور (٢١)

والله اعلم كه ژن و مێرد دەگەینرێن یا دایك و باوك و منداڵەكانیان ئەوە كامیان پلەی نزمتر بێت دەهنرێت بۆلای پله بەرزەكه

## بەهەشتیەكان داخ لەیەك شت دەخۆن

عن معاذ بن جبل قال : قاك رسول الله (ﷺ): ((یتحسر أهل الجنة إلا على ساعة مرت بهم لم یذكروا الله فیها [٧٠]))

واته : خەڵكی بەهەشت ئاخ ناكێشن لەسەر هیچ شتێك تەنها لەسەر كاتێك نەبێت كه بەسەریان رۆشتوه ( لەدوونیادا ) یادی خوای زاڵ و پایه بەرزیان تیادا نەكردۆتەوە، یەكێك له پێشینەكان دەڵی : له رۆژی قیامەتدا ئادەمیزاد كاتەكانی تەمەنی نیشان دەدرێ جا هەر كاتێك تەمەنی لەیادی خودا بەسەر نەبردبێ ئەوا له داخان شەق شەق دەبێت

[7] رواه الطبرانی و البیهقی

## بەهەشتیەکان بە سی جۆر بازن دەرازینرێنەوە وە پۆشاکیان ئاوریشمە

خودای گەورە دەفەرموێ:﴿ إِنَّ اللَّهَ يُدْخِلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِنْ ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِير [٧١]﴾

واتە : بەراستی خودا ئەوانەی کە باوەریان هێناوە و کردەوەی چاکەیان کردووە دەیانخاتە بەهەشتانێك کە رووباری زۆر بە ژێریاندا دەروات (ئەوان) دەرازێنرێنەوە لەو (بەهەشتدا) بە بازنی زێر و مرواری وە پۆشاکیان لە بەهەشتدا ئاوریشمە

وە خوا دەفەرموێ: ﴿وَحُلُّوا أَسَاوِرَ مِنْ فِضَّةٍ [٧٢]﴾

واتە : بازنەکانیان لە زیوە

---

[7] سورة الحج (٢٣)

[7] سورة الأنسان (٢١)

## بازاری بەهەشت

عن أنس بن مالك : ان رسول الله (ﷺ) قال:(( إن في الجنة لسوقا يأتونها كل جمعة فتهب ريح الشمال فتحثو في وجوههم وثيابهم فيزدادون حسنا وجمالا فيرجعون إلى أهليهم وقد ازدادوا حسنا وجمالا فيقول لهم أهلوهم والله لقد ازددتم بعدنا حسنا وجمالا فيقولون وأنتم والله لقد ازددتم بعدنا حسنا وجمال))[٧٣]

واته : بێگومان بەهەشت بازارێکی لێیە هەموو هەینیەك بەهەشتیەکان دەچن بۆ ئەو بازارە ئەوجا بای باکوور هەڵ دەکات و دەدات بە دەم و چاوو جل و بەرگیاندا جوانی و قەشەنگی یان زیاد دەکات ئەوجا دەگەرێنەوە لای خێزانەکانیانن ئەوانیش جوانی و قەشەنگیان زیاد کردوە ، جا خێزانەکانیان پێیان دەڵین : سوێند بەخوا لە دوای ئێمە

---

[7] رواه المسلم (٢٨٣٣)

جوانی و قەشەنگیتان زیادی کردووە جا ئەوانیش دەڵێن : وە ئێوەش سوێند بەخوا لە دوای ئێمە جوانی و قەشەنگیتان زیادی کردووە

**ئاخیر کەس کە دەچیتە بەهەشت چی پێ دەدرێ ؟**

عن عبدالله بن مسعود قال النبی (ﷺ) :قال رسول الل ه صلى الله عليه وسلم:(( إني لأعلم آخر أهل النار خروجا منها وآخر أهل الجنة دخولا الجنة رجل يخرج من النار حبوا فيقول الله تبارك وتعالى له اذهب فادخل الجنة فيأتيها فيخيل إليه أنها ملأى فيرجع فيقول يا رب وجدتها ملأى فيقول الله تبارك وتعالى له اذهب فادخل الجنة قال فيأتيها فيخيل إليه أنها ملأى فيرجع فيقول يا رب وجدتها ملأى فيقول الله له اذهب فادخل الجنة فإن لك مثل الدنيا وعشرة أمثالها أو إن لك عشرة أمثال الدنيا قال فيقول أتسخر بي أو أتضحك بي وأنت الملك قال لقد رأيت رسول الله صلى الله عليه وسلم ضحك

حتى بدت نواجذه قال فكان يقال ذاك أدنى أهل الجنة منزلة[٧٤]))

واتە :من زۆر بە باشێ دەزانم کە دواهەمین کەس دەچێتە دۆزەخ دەردەچی کێیە و دواهەمین کەس دەچیتە بەهەشت کێیە ، پیاوەکە لەسەر دەست و پێیان بە گاگۆڵکە لە دۆزەخ دێتە دەرەوە ، جا خودا دەفەرموێ : برۆ بچۆ ناو بەهەشت جا ئەویش دەچێ و بەرەو بەهەشت وا دەکوێتە پێش چاوی کە بەهەشت پرە جا دەگەرێتەوە دەڵێ : ئەی پەروەدگارم بەهەشتم بینی پرر بوو ، جا خودا پێی دەفەرموێ : برۆ بچۆ بۆ بەهەشت جا ئەویش دەچێ بۆ لای بەهەشت وا دەکوێتە بەر چاوی کە بەهەشت پرە دیسان بە پەروەدگاری دەڵی کە دەڵی بینیم بەهەشت پرە دیسان دەڵی برۆ بۆ بەهەشت بەقەد دونیاو دە ئەوەندەی تریش (لەبەهەشت) بۆتۆ بێت یا دەئەوەندەی دونیا بۆتۆ بێت ، پیاوەکە دەڵێ : گاڵتەی پێدەکەی یان پێم پێدەکەنی لە کاتێکدا تۆ پادشای ، ابن

---

[7] رواه البخارى (٦٥٧١) و مسلم (١٨٦)

مسعود دەڵی پێغەمبەرم بینی (ﷺ) پێکەنی تا ددانەکانی دوواوەی بەدەرکەوت ، وە گوتراوە نزمیترین شوێن و مەنزلگای خەڵکی بەهەشتە .

*(قال فكان يقال ذاك أدنى أهل الجنة ) : فەرموودە نیە

## ئەوانەی دەچنە بەهەشت بێ حیساب و عەزاب دەچنە بەهەشت

عن ابن عباس عن النبى (ﷺ) عنه قال :((عرضت علي الأمم فرأيت النبي ومعه الرهيط والنبي ومعه الرجل والرجلان والنبي ليس معه أحد إذ رفع لي سواد عظيم فظننت أنهم أمتي فقيل لي هذا موسى صلى الله عليه وسلم وقومه ولكن انظر إلى الأفق فنظرت فإذا سواد عظيم فقيل لي انظر إلى الأفق الآخر فإذا سواد عظيم فقيل لي هذه أمتك ومعهم سبعون ألفا يدخلون الجنة بغير حساب ولا عذاب ثم نهض فدخل منزله فخاض الناس في أولئك الذين يدخلون الجنة بغير حساب ولا عذاب)) ص ٢٠٠ - فقال بعضهم فلعلهم الذين صحبوا رسول الله صلى الله عليه وسلم وقال بعضهم فلعلهم الذين ولدوا في الإسلام ولم يشركوا بالله وذكروا أشياء فخرج عليهم رسول الله صلى الله عليه وسلم فقال:(( ما الذي تخوضون فيه؟)) فأخبروه ،فقال:(( هم الذين لا يرقون ولا

یسترقون ولا یتطیرون وعلى ربهم یتوكلون فقام عكاشة بن محصن فقال ادع الله أن یجعلني منهم فقال أنت منهم ثم قام رجل آخر فقال ادع الله أن یجعلني منهم فقال سبقك بها عكاشة[٧٥]))

واتە : ئوممەتی پێغەمبەرەكانم نیشاندرا پێغەمبەرم بینی (رهیط)ێكی لەگەڵ دا بوو (رهیط : لەسێ تاوەكو نۆیە ) وە پێغەمبەرم بینی پیاوێك یا دوو پیاوی لەگەڵدا بوو وە پێغەمبەرم بینی كەسی لەگەڵ نەبوو ، رەشاییەكی گەورەم نیشان درا وە گومان برد كە ئەوە ئەموتەكەی من بێت، پێی ووترا ئەوە موسا و گەلەكەیەتی ئەوجا تەماشام كرد رەشایەكی گەورەم بینی پیم وترا ئەوە ئوومەتەكەی تۆیە حەفتا هەزار كەسیان لەگەڵ دایە بەبێ لێپرسینەوە و بێ عەزاب دەچنە بەهەشت لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) هەستاوە چۆوە ماڵەكەی خۆی ، ئەوجا خەڵك دەربارەی ئەو حەفتا هەزارە بووە مشتومڕیان، هەندێكیان گوتیان لەوانەیە

---

[7] رواه المسلم (٢٢٠)

ئەوانەبن کە هاورێیەتی پێغەمبەریان کردووە وە هەندێکیان وتیان : لەوانەیە ئەو حەفتا هەزارە ئەوانە بن کە لە ئیسلام لە دایك بوونە هیچ شرکێکیان بۆ خودا بریار نەداوە وە چەند شتێکی تریان باس کرد ، جا پێغەمبەر (ﷺ) دەرچوو و چوو ناویان ئەصحابەکان هەواڵیان بە پێغەمبەر دا (ﷺ) کە چیان گووتوە لە نێوان خۆیاندا جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئەوانەن کە لە کەس دوا ناکەن دوعایان بەسەردا بخوێنن وە داوا لەکەس ناکەن کە داخیان بکەن وە رەشبین نین بە باڵندە و شتی لەم جۆرە وە پشت بە پەروەدگاریان دەبەست ،

عوکاشەی کوری محصن هەستا گوتی : دوعام بۆ بکە لە خوا کە لەوان بم پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی تۆ لەوانی پاشان پیاوێکی ترر هەستا وتی دوعام بۆ بکە، ئەویش فەرمووی(ﷺ) عوکاشە پێشت کەوت .

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ:(( أعطيت سبعين ألفاً من أمتي يدخلون الجنة بغير حساب، وجوههم كالقمر ليلة البدر،

قلوبهم على قلب رجل واحد، فاستزدت ربي عز وجل، فزادني مع كل واحد سبعين ألفاً [٧٦]))

واتە : پێم بەخشرا حەفتا هەزار کەس لە ئومەتەکەم دەچنە بەهەشت بەبێ حیساب روویان وەك مانگی شەوی چواردەیە دڵیان وەکو دڵی یەك پیاو وایە جا داوای زیاترم کرد لە پەروەدگارم (عز و جل) ئەویش لەگەڵ یەکێکدا حەفتا هەزاری بۆ زیاد کردم

[7] رواه أحمد (الجامع ١٠٥٧)

## حۆری و هاوسەر لە بەهەشتدا

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ الْيَوْمَ فِي شُغُلٍ فَاكِهُونَ (٥٥) هُمْ وَأَزْوَاجُهُمْ فِي ظِلَالٍ عَلَى الْأَرَائِكِ مُتَّكِئُونَ(٥٦) لَهُمْ فِيهَا فَاكِهَةٌ وَلَهُمْ مَا يَدَّعُونَ (٥٧) سَلَامٌ قَوْلًا مِنْ رَبٍّ رَحِيمٍ (٥٨)﴾[٧٧]

واتە : بەراستی بەهەشتیەکان ئەمڕۆ لە خۆشی و شادید سەر قاڵن (٥٥) خۆیان و هاوسەرەکانینان لە سێبەرەکاندا لەسەر تەخت (ی ڕازاوە) پاڵیان داوەتەوە (٥٦) لەو (بەهەشت) دا بۆیان ئامادەیە میوەهات و هەرچی داوا بکا (٥٧) سەلام (یان لێدەکرێ ) بە ووتە لە لایەن پەروەدگاری میهرەبان (٥٨)

وە خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿وَعِنْدَهُمْ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ عِينٌ (٤٨) كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَكْنُونٌ (٤٩) ﴾[٧٨]

---

[7] سورة يس (٥٥-٥٨)

[7] سورة الصافات (٤٨-٤٩)

واتە : وە ئافرەتی چاو گەورەیان لایە کە جگەلە مێردەکانینان سەیری کەس ناکەن (٤٨) وەکو هێلکەی داپۆشراو (٤٩)

وە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَحُورٌ عِينٌ (٢٢) كَأَمْثَالِ اللُّؤْلُؤِ الْمَكْنُونِ (٢٣)[٧٩]﴾

واتە : حور ، تاکە کۆیەکەی (حوراء) ئەو ئافرەتەی سپیاتیەکەی چاوی زۆر سپیە وەرەشاتیەکەی زۆر رەشە . عین ، تاك کۆیەکەی (عیناء) ،ئەو ئافرەتەی چاوی وەك مرواری ناو دەف وان

وە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا[٨٠] ﴾

واتە : کچانی تازە مەمك کردووی هاو تەمەن (دەدرێ بە خاوەنەکانیان) وە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فِيهِنَّ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنْسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَانٌّ ( ٥٧) فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ (٥٨)[٨١]﴾

واتە : لەو باخانەدا هەن حۆریانێکن کە تەنها چاویان لە مێردی خۆیانە پێش ئەوانە دەستی کەسیان لێ نەکەوتوە نە

---

[7] سورة الواقعة (٢٢-٢٣)

[8] سورة النبأ (٣٢)

[8] سورة الرحمن (٥٦-٥٨)

لەئادەمی نەلەجنۆکە(٥٧)جابە کام نیعمەتەکانی پەروەگارتان بێبروان (٥٨) ئەو حۆریانە وەك یاقووت و مەرجانن (٥٩)

وە هەروەها خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿فِيهِنَّ خَيْرَاتٌ حِسَانٌ (٧٠) فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ (٧١) حُورٌ مَقْصُورَاتٌ فِي الْخِيَامِ (٧٢)﴾[٨٢]

واتە : تیایاندا هەیە ئافرەتی ئاکار چاکی رواڵەت جوان (٧٠) جا بەکام نیعمەتەکانی پەروەدگارتان بێ رەوان (٧١) (ئەو ئافرەتانە کە) رەشێنەکەی چاویان زۆر رەشە وە سپێنەکەی چاویان زۆر سپیە راگیراون لە خێوەتەکان دا ( لە خێوەی نایەنەدەر) (٧٢)

[8] سورة الرحمن (٧٠-٧٢)

## هەموو بەهەشتیەکان دوو خێزانیان پێ دەدرێ

عن ابی هريرة عن رسول الله (ﷺ) قال : ((إنَّ أَوَّلَ زُمْرَةٍ يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ عَلَى أَشَدِّ كَوْكَبٍ دُرِّيٍّ فِي السَّمَاءِ إِضَاءَةً، لا يَبُولُونَ، وَلا يَتَغَوَّطُونَ، وَلا يَتْفُلُونَ، وَلا يَمْتَخِطُونَ، أَمْشَاطُهُمُ الذَّهَبُ، وَرَشْحُهُمُ المِسْكُ، وَمَجَامِرُهُمُ الأَلُوَّةُ، وَأَزْوَاجُهُمُ الحُورُ العِينُ، عَلَى خَلْقِ رَجُلٍ وَاحِدٍ، عَلَى صُورَةِ أَبِيهِمْ آدَمَ سِتُّونَ ذِرَاعاً فِي السَّمَاءِ[٨٣]))

واتە : یەکەم کۆمەڵە و دەستە کە دەچنە بەهەشت لەسەر وێنەی مانگن لە شەوی چواردەدا دەستەی دوای ئەوان وەك گەشترین ئەستێرە وان ، دڵەکانیان وەکو دڵی یەك پیاو وایە نە جیاوازی و ناکۆکیەکان لە نێوانیاندا هەیە نە عادزی و رق کینە ، هەر یەکێکك لەوان دوو هاوسەرەی هەیە، یەکێك لەم دوو هاوسەرە مۆخی ئێسقانی لاقی دەبینرێ لە پشت گۆشتەکەیەوە ولە جوانیدا بەیانی و ئێوارە یادو تەسبیحاتی خودا دەکەن ، نەخۆش ناکەون وە چلم ناسرن وە تف ناکەن

---

[٨] رواه البخاری (٣٢٤٦)

قاپەکانیان زێر و زیوە وە شەیەکانیان زێرە وە سوتەمەنی بخوردانەکانیان عودە وە ئارەقەیان مسکە .

وە خودا دەفەرموێ ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِمْ مِنْ غِلٍّ إِخْوَانًا عَلَى سُرُرٍ مُتَقَابِلِينَ (٤٧) لَا يَمَسُّهُمْ فِيهَا نَصَبٌ وَمَا هُمْ (٤٨)﴾[٨٤]

واتە : وە دەردەهێنرێت هەر کینە و بوغزێك کە دڵیان بووبێ برای یەکترن بەرامبەر یەکتر لەسەر کورسی دادەنیشن(٤٧) لەوێدا ماندوو بونیان تووش نایەتو وە هەرگیز لەو (بەهەشتەدا) دەرناکرێن

١- شەهید ٧٢ حۆری پێ دەدرێ

٢- هێندێك بەڵگە دەهێننەوە کە بەهەشتیەکان دوو خێزان زیاتریان پێ دەدرێ .

[8] سورة الحجر (٤٧-٤٨)

## ئافرەتی بەهەشت زۆر بە شەوق و بۆن خۆشن

عن انس بن مالك عن النبى انه قال: ((ولو أن امرأة من نساء أهل الجنة اطلعت إلى الأرض لأضاءت ما بينهما ولملأت ما بينهما ريحا ولنصيفها يعني الخمار خير من الدنيا وما فيها[٨٥]))

واتە: ئەگەر ئافرەتێك لە خەڵكی بەهەشت تەماشای زەوی بكات نێوانیان رووناك دەكاتەوە وە پری دەكات لە بۆن، وە ئەو سەرپۆشەی كە لەسەریەتی باشترە لە دونیا و ئەوەی كە تیایەتی .

[8] رواه البخاری (٢٧٩٦)

## ژیانی جنسی لە بەهەشت

عن ابی هریرة قال : قیل یا رسول الله (ﷺ) هَلْ نَصلُ إلَى نسَائنَا فِي الْجَنَّة ؟ فَقَالَ: ((إنَّ الرَّجُلَ لَيصلُ فِي الْيَوْمِ إلَى مائَة عَذْرَاء[٨٦]))

واتە : ئەبو هورەیرە دەڵێ : گوترا ئەی پێغمبەری خوا ئایا لە بەهەشتدا دەگەین بە ئافرەتەکانمان و لەگەڵیان جووت دەبین؟ فەرمووی : بێ گومان پیاو (لەبەهەشت) لە رۆژێکدا لەگەڵ سەت کچدا جووت دەبێت .

عن ابی هریرة قال : قیل للنبی (ﷺ) انطا فی الجنة ؟ قال : ((نعم و الذی نفسی بیده دحما دحما . فاذا قام عنها رجعت مطهرة بكرا[٨٧]))

واتە : ئەبوو هورەیرە دەڵێ : بە پێغەمبەر گوترا (ﷺ) ئایا لەبەهەشتدا جووت بوون و جیماع هەیە ؟ فەرموی : سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە جیماع لە دوای جیماع دەکەن هەرکە پیاوەکە کاری خۆی تەواو کرد ئافرەتەکە پاك دەبێتەوە و دەبێتەوە کچ

[٨] رواه البزار (٣٥٢٥)

[٨] رواه البزار (٣٥٢٤)

عن زيد بن ارقم قال، قال رسول الله (ﷺ): ((إِنَّ الرَّجُلَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ يُعْطَى قُوَّةَ مِائَةِ رَجُلٍ فِي الْأَكْلِ وَالشُّرْبِ وَالشَّهْوَةِ وَالْجِمَاعِ[٨٨]))

واته : پیاوی ئەهلی بەهەشت توانای سەت پیاویان پێ دەدرێ (لەبەهشت) لە خواردن و خودارنەوە و جووت بوون

عن انس عن النبى (ﷺ) قال : ((يعطى المؤمن في الجنة قوة كذا وكذا من الجماع". قيل: يا رسول الله! أويطيق ذلك؟ قال: "يعطى قوة مائة[٨٩]))

واته : ئیماندار لە بەهەشت هێز و تاقەتی ئەوەندە و ئەوندەی پێ دەرردرێ بۆ جیماع کردن ، گوترا ئەی پێغەمبەری خوا ئایا توانای ئەوەندەی هەیە ؟ فەرمووی (ﷺ) هێزی سەت زەلامی پێ دەدرێ (هەرپیاوەك)

[8] صحيح الجامع (١٦٢٧)

[8] رواه الترمذى (٢٥٣٦)

## حۆریەکانی بەهەشت بەرگری لە مێردەکانیان دەکەن لە دونیا

عن معاذ بن جبل عن النبى (ﷺ) قال : عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: ((لا تؤذي امرأة زوجها في الدنيا إلا قالت زوجته من الحور العين لا تؤذيه قاتلك الله فإنما هو عندك دخيل يوشك أن يفارقك إلينا[٩٠]))

واته : هیچ ئافرەتێك مێردەکەی خۆی ئازار نادات لە دونیا ئیلا خێزانە بەهەشتیەکەی لە (حور العين) پێی دەڵێ ئەزیەتی مەدە خوا بتکوژێ ئەوە لای تۆ میوانە زۆری نەماوە کە تۆ بەجێ بێڵێ و بگەڕێتەوە بۆ لامان .

[9] رواه الترمذی (١١٧٤)

## ژن بۆ دوا مێردی دەبێت لە بەهەشت

عن ابی الدرداء قال : قال الرسول الله (ﷺ) : انما امرأة تُوفي عنها زوجها ، فتزوجت بعده ، فهي لآخر أزواجها[9]))

واتە : کاتێك ژنێك مێردەکەی دەمرێت و دوای شوو بکات ئەوا دوا مێردی لەبەهەشتدا بۆی دەبێت

( چونکە سروشتی ئافرەت وایە کە دەبێت یەك مێردی (خاوەنی) هەبێت )

---

[9] صحيح الجامع (٢٧٠٤)

## کێ دەیەوێ بێ ژوومار حۆری هەبێت

عن سهل بن معأذ عن النبى (ﷺ) قال : ((أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال من كظم غيظا وهو قادر على أن ينفذه دعاه الله عز وجل على رؤس الخلائق يوم القيامة حتى يخيره الله من الحور العين ما تشاء[٩٢]))

واتە : هەر یەکێك تورەیی بخواتەوەو قوت بداتەوە ، وە توانای ئەنجامدانیشی هەبێت و بتوانێ رقەکەی برێژێ ، یەوە لە رۆژی قیامەتدا خوا لەبەر چاوی خەڵك بانگی دەکات و دەیکا بەسەر پشك کە بە ئارەزووی خۆی لە (حور العین) هەڵبژێرێ چەندی دەوێ

[٩٢] رواه الترمذى (٢٠٢٨)

# خزمەتکارەکانی بەهەشت

خوای گەروە دەفەرموێ: ﴿ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَنْثُورًا[٩٣] ﴾

واتە : دەگەڕێن بەسەریاندا نەوجەوانی هەمیشەیی کاتێك دەیان بینیت وا دەزانیت مرواری برژاون .

وە خوای گەروره دەفەرموێ:﴿ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ غِلْمَانٌ لَهُمْ كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَكْنُونٌ [٩٤]﴾

واتە : وە دەگەڕێن بە سەریاندا کورانی نەوجەوانی خۆیان دەڵێی مرواری ناو سەدەفن (لەجوانی وپاکی)

وە خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُخَلَّدُونَ(١٧) بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِنْ مَعِينٍ (١٨)[٩٥] ﴾

---

[٩] سورة الأنسان (١٩)

[٩] سورة الطور (٢٤)

[٩] سورة الواقعة (١٧-١٨)

واتە : تـازە لاوی هەمیشـەی بەسـەریاندا دەگەڕێـن (١٧) بە پەرداغ و دۆڵکە و گلاسـی پـڕ لە شـەرابی سـەرچاوەی ڕەوان (١٨)

عـن انـس قـال : قـال رسـول اللـه (ﷺ) : ((إن أسـفل أهـل الجنة أجمعين درجة لمن يقوم على رأسه عشرة آلاف خادم بيد كل واحد صحفتان واحدة من ذهب والأخرى من فضة.[٩٦]))

واتە : بێگومـان ئەوەی نـزمترین پـلەی هەیە لە بەهەشـت دەهەزار خزمەتکار لای سەریەوە وەستاوە هەر یەکێك لەوان دوو قاپی بە دەستە یەکێکیان زێڕە ئەوی تر زیوە .

عـــن عبداللـــه بـــن عمـــرو قـــال : أن أدنى أهـــل الجنـــة منزلة من يسعى عليه ألف خادم كل خـادم عـلى عمـل لـيس عليه صاحبه [٩٧]

واتە : عبدالله کوری عەمر دەڵـێ : بێگومـان ئەو کەسـەی لە نزمترین پلەی بەهەشـتدایە ئەوەیە هەزار خزمەتکـار دێـن و دەچن لە خزمەتکردنیدا هەموو خزمەتکارێك کارێك دەکـات هاورێکەی ئەو کارە ناکات .

---

[٩٦] المجمع (١٨٦٧)

[٩٧] أخرجه البيهقي أنظر (الترهيب ٣٧٠٥)

## باڵندەی بەهەشت

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَحْمِ طَيْرٍ مِمَّا يَشْتَهُونَ[٩٨]﴾
واتە : وە گۆشتی هەر باڵندەیەك كە حەزی لێ بكەن .

عن انس قال : قال رسول الله (ﷺ) : ((إن طير الجنة كأمثال البخت يرعى في شجر الجنة)) فقال أبو بكر: يا رسول اللّه، إن هذه لطير ناعمة، فقال: ((آكلها أنعم منها - قالها ثلاثاً - وإني لأرجو أن تكون ممن يأكل منها [٩٩]))

واتە : بێگومان باڵندەی بەهەشت وەك حوشتری بوخت وایە (جۆرێكە لە حوشتر ملی زۆر درێژە) لە درەختی بەهەشت دەخۆن ، ئەبو بوكریش ووتی : بە راستی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو باڵندە نەرم و ناسكن ئەویش فەرمووی : ئەوەی دەیانخوات نەرم و ناسكترە - سێ جار ئەوەی فەرموو - وە هیوادارم تۆ لەو كەسانە بیت كە دەیخۆیت(مەبەستی ئیمامی ئەبوبەكرە)

---

[٩٨] سورة الواقعة (٢١)

[٩٩] رواه أحمد (مسند ١٢٨٩٨)

ئەبو ئەمامە دەڵێت : پیاوێکی بەهەشت زۆر حەز لە تەیرێك دەکات لە تەیرەکانی بەهەشت، تەیرەکە دێتە ناو دەستی بە شەق کراوی و برژاوی

## میوەو دارو باری بەهەشت

خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي ظِلَالٍ وَعُيُونٍ (٤١) وَفَوَاكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ (٤٢) كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ (٤٣) إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (٤٤)﴾[١٠٠]

واتە : بێگومان پارێزکاران لە سێبەر و (قەراغی) کانیاوی زۆرن (٤١) وە لەناو میوەهاتێك دان کە حەزی لێ دەکەن (٤٢) بخۆن و بخۆنەوە نۆشتان بێت هۆی ئەوەی کە دەتان کرد (٤٣) بێگومان ئێمە وا پاداشتی چاکان دەدینەوە (٤٤)

عن ابن عباس قال : قال رسول الله (ﷺ) : ((فقال إني رأيت الجنة فتناولت منها عنقودا ولو أخذته لأكلتم منه ما بقيت الدنيا ورأيت النار فلم أر كاليوم منظرا قط ورأيت أكثر أهلها النساء)) قالوا بم يا رسول الله، قال: ((بكفرهن قيل أيكفرن بالله قال بكفر العشير وبكفر الإحسان لو أحسنت إلى

---

[١٠٠] سورة المرسلات (٤١-٤٤)

إحداهن الدهر ثم رأت منك شيئا قالت ما رأيت منك خيرا قط[١٠١]))

واته : بێگومان من بەهەشتم بینی جا دەستم برد بۆ هێشووە ترێیەك ئەگەر لێم کردباوە بێگومان تا دونیا دەما هەر لێتان دەخوارد . وە ئاگرم نیشان درا قەت هیچ دیمەنێکی خراپترم وەکو ئەو رۆژە نەبینیوە وە بینیم زۆربەی ئەوانەی کە تیایدا بوو ئافرەت بوون گووتیان بە چی ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ؟ فەرمووی : بە داپۆشینیان گوترا : کوفر دەکەن ؟فەرمووی : چاکەی مێردیان دادەپۆشن . ئەگەر بە درێژای زەمان چاکە لەگەڵ یەکێکیان بکەیت لە پاشان شتێکی بینی دەڵێ : قەت هیچ خێرێکم لێت نەبینوە .

عن انس بن مالك عن النبى (ﷺ) قال : ((ان في الجنة لشجرة يسير الراكب في ظلها مائة سنة لا يقطعها[١٠٢]))

واته : بێگومان لە بەهەشتدا درەختێ هەیە سوار سەد ساڵان لە سێبەرەکەی دەروات هێشتا نایبرێت

---

رواه البخارى (١٠٥٢) و مسلم (٩٠٧)

رواه البخارى (٣٢٥١) و مسلم (٢٨٢٦)

## لە رووبارەکانی بەهەشت

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْكَبِيرُ﴾[١٠٣]

واتە : بێگومان ئەوانەی بروایان هێناوە و کردەوەی چاکەیان کردووە بۆ ئەوان هەیە بە هەشتانێك کە رووباری زۆر بە ژێریان دا دەروارت ئائەوەیە سەرکەوتنی گەورە

وە هەروەهاخوای گەورە دەفەرموێ: ﴿مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ فِيهَا أَنْهَارٌ مِنْ مَاءٍ غَيْرِ آسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِنْ لَبَنٍ لَمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ وَأَنْهَارٌ مِنْ خَمْرٍ لَذَّةٍ لِلشَّارِبِينَ وَأَنْهَارٌ مِنْ عَسَلٍ مُصَفًّى وَلَهُمْ فِيهَا مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَمَغْفِرَةٌ مِنْ رَبِّهِمْ كَمَنْ هُوَ خَالِدٌ فِي النَّارِ وَسُقُوا مَاءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءَهُمْ﴾[١٠٤]

واتە : شێوەی ئەو بەهەشتە وایە کە بەڵێن دراوە بە پارێزکاران چەندەها رووباری تێدایە لە ئاوی تێك نەچوو وە چەندەها رووبار لە شیر کە تامی نەگۆراوە وە چەندەها رووبار لە ئارەق و شەرابێك کە خۆش و پاڵاوتەکراوە (وەکو

---

[١٠٣] سورة البروج (١١)

[١٠٤] سورة محمد (١٥)

دونیا نیه و سەرخۆشت ناکا) وه لەوێ له هەموو جۆره میوەیەك هەیه بۆ ئەوان لەگەڵ لێبوردن له پەروەدگاریانەوه (ئایا ئەو بەهەشتانه) وەکو کاسانێك وان که له ئاگری دۆزەخ دابن به هەمیشەیی . وه ئاوێك دەرخواردیان ئەدرێ که له پلەی هەره بەرزی گەرمیدایەو کەئەیخۆنەوه ریخۆلەکەکانیان پارچه پارچه ئەکات .

عن ابی هريرة عن النبی (ﷺ) قال:
((إِذَا سَأَلْتُمُ اللَّهَ فَسَلُوهُ الْفِرْدَوْسَ ، فَإِنَّهُ أَوْسَطُ الْجَنَّةِ ، وَأَعْلَى الْجَنَّةِ ، وَفَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ ، وَمِنْهُ تَفَجَّرُ أَنْهَارُ الْجَنَّةِ[١٠٥]))

واته : ئەگەر داواتان له خوا کرد داوای فیردەوسی لێ بکەن چونکه ئەو ناوەراستی بەهەشته و بەرزترین شوێنی بەهەشته ، وه سەرەوەی ئەو عەرشی خوایه وه له وێوه رووبارەکانی بەهەشت هەڵدەقوڵێن.

عن عبدالله بن عمر قال : قال رسول الله (ﷺ): ((الكوثر نهر في الجنة حافتاه من ذهب ومجراه على الدر والياقوت تربته أطيب من المسك وماؤه أحلى من العسل وأبيض من الثلج[١٠٦]))

---

[١٠٥] رواه البخاری (٧٤٢٣)

[١٠٦] رواه الترمذی (٣٣٦١) و ابن ماجه (٤٣٣٤)

واتە : کەوسەر رووبارێکە لە بەهەشت ئەملا و ئەولای لەزێرە شوێنی پێدا رۆشتنی ئاوەکە لە دوور گەوهەرە خاکەکەشی بۆنی خۆشترە لە میسك وە ئاوەکەی لە هەنگوین شیرینترە و لە بەفر سپیترە

## داوات بەهەشت کردن لە خوا

عن انس بن مالك قال : قال رسول الله (ﷺ) : ((من سأل الله الجنة ثلاث مرات قالت الجنة اللهم أدخله الجنة ومن استجار من النار ثلاث مرات قالت النار اللهم أجره من النار[١٠٧]))

واتە : هەر کەسێك سێ جاران داوای بەهەشت بکات لە خوا بەهەشت دەڵێ : ئەی خوایە بیبەە بەهەشت وە هەر کەسێك سێ جاران خۆی لە ئاگر بپارێزێ ئاگر دەڵێ : ئەی خوایە لە ئاگر بیپارێزە

عن ابی هريرة قال : قال رسول الله (ﷺ): ((ما استجار عبد من النار سبع مرات في يوم إلا قالت النار: يا رب إن عبدك

---

رواه الترمذی (٢٥٧٢)

فلانا قد استجارك مني فأجره، ولا يسأل الله عبد الجنة في يوم سبع مرات إلا قالت الجنة: يا رب إن عبدك فلانا سألني فأدخله الجنة[١٠٨]))

واته : هیچ بەندەیەك خۆی پاراست لە ئاگر حەوت جار ئیللا ئاگر گوتوویەتی : ئەی پەروەدگارم فلانە بەندەت خۆی لەمن پاراستوە جا تۆش بیپارێزە وە هیچ بەندەیەك داوای بەهەشتی نەکردووە حەوتجاران ئیللا بەهەشت گوتوویەتی : ئەی پەروەدگارم فلانە بەندەت داوای منی کردووە جا تۆش بیبە بەهەشت .

بەرێزەکەم ؛ دەتەوێ دوو هەزارم لەگەڵ بگۆریەوە لەگەڵ یەک هەزار ! بێگومان دەڵێی نەخێر نامەوێ ! ئێ ئەمەش هەر وەک ئەمەیە کە ئەو بەهەشتە بە ئەم دونیایە ناخۆش و خراپە دەگۆریتەوە بە شوێنێک نە حەسودی و خراپەکاری و ...... کاری خراپ و ناشرینی تیدانیە ! وتەیەکی زۆر جوان هەیە کە دەڵێ (تەمەنت چەند بەرێ کردیە ئەوەندە لە خوا نزیک بویەوە وە چەندد مایە هەوڵبدە تا لە خوا نزیک بیت) هەستە با پێکەوە تەوبەکی بکەین و بگەرێنەوە لای خوا .

---

رواه ابو على يعلى فى المسند (٦١٩٤)

## چۆن تەوبە بکەم

وەکو بتەوێ پێم بڵیی : نەفسم دەیەوێ بگەرێتەوە لای خودا و پەشیمان بێتەوە و بچمە بەهەشت نەفسم دڵنیا بووە لەوەی سەرفرازی لە شوێن کەوتنی هەواو ئارەزوەکان و ئەنجام دانی کارە حەرامکراوەکان نیە ، بەڵکو لە شوێنکەوتنی رێگای حەقی ئیسلامە ؛ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نازانم چۆن تەوبە بکەم ؟ وە چۆن یەکەم هەنگاو بنێم ؟

خوای مەزن چاکەی بۆ هەر بەندەیەکی خۆی بوێت ، هۆکارەکانی بەدەستهێنانی بۆ ئاسان دەکات وبەهەمان شێوەش لە تەوبەکردن یارمەتی دەدات ،جا لێرەدا باسی هەندێک لەو شتانە دەکەین کە یارمەتیت دەدەن و هاوکاریت دەکەن بۆ تەوبە کردن و گەرانەوە بۆ لای خودا.

نیەت ساغ کردنەوە و بەراستی بگەرێوە : ئەگەر مرۆڤ نیەتی بۆ خوا ساغ کاتەوە ، وە راست بکەت لە تەوبە کردنەی ئەوە پەروەدگار یارمەتی دەدات وکارئاسانی بۆ دەکات، وە هەموو

ئەو بەربەست و لابەرانە دێنە رێگای تەوبەکردنەکەی لەسەر لادەدات ، وە هەر کەسێک موخلیس و ساغ نەبێت لە بۆ خودا ئەوا شەیتان فەرمان رەوای دەکات هەر وەکو چۆن خوای گەروە دەفەرموێ:﴿ كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاءَ ۚ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ [١٠٩]﴾

واتە : ئا بەو شێوەیەمان کرد بۆ ئەوەی هەرچی تاوان وخراپەیە لێی دوورخەینەوە ، بەراستی ئەو (یوسفە) لە بەندە دڵسۆزەکانی ئێمە بوو .

١- موحاسەبەی نەفسی خۆت بکە :چەنکە موحاسەبەی نەفس هاندەرە بۆ پەلەکردن بۆ کاری خێر ، وە هاوکارە بۆ روبەرووبونەی تاوان ، وە یارمەتیدەرە بۆ گەیشتن بەوەی کە لەدەست چووە ، وە پلەیەکە مرۆڤ وا لێدەکات بزانێت چی بۆ هەیە و چی لەسەرە ، وە هاویاری مرۆڤە بۆ تەوبەکردن وە بەردەوام بوون لەسەر تەوبەکردنەکەی

٢- یادی نەفسی خۆت بخەرەوە و ئامۆژگاری بکە و

---

[١٠٩] سورة يوسف ٢٤

سەرزەنشتی بکە و بیترسێنە : پێی بڵێ : ئەی نەفس بگەرێوە پێش ئەوەی بمری ، چونکە مردن لە ناکاوە ، مردنی ئەم و ئەوی یاد بهێنەوە . نازانی مردن مەوعیدی تۆیە ؟ گۆر ماڵی تۆیە ؟ خۆڵ فەرشی ژێرتە ؟ گڵخۆرکە دەبێتە ئاشنات ؟ ناترسی فریشتەی گیان کێشان یەخەت پێبگرێ و تۆش لەسەر تاوانکردن بەردەوامی ؟ لەو کاتەدا پەشیمانی دادت نادات گریە و دڵ تەنگیت لێوەردەگیرێ

تیاچیت ئەی نەفس پشت لە ئاخیرەکەت دەکەیت ئەو روی لە تۆیە بەرەو تۆیە بەرو تۆ دێت ؟ وە روو لە دونیا دەکەیت لاکاتێکدا ئەو لە پشتی لێت کردووە ! ئا بەو شێوەیە بە بەردەوامی سەرزەنشتی بکە وگلەیی لێبکە و یادی بهێەوە هەتا لەخوا دەترسی و تەوبە دەکەیت ودەگەرێیەوە

٣- خۆت لەو شوێنانە بە دوور بخە کەتاوانی تێدا دەکرێت : وازهێنان لەو جێگایانەی کە تاوان تێدا دەکرێت یارمەتیت دەدات بۆ تەوبەکردن ، هەر بۆیە دەبینیت ئەو پیاوەی کە نەوەد و نۆکەسی کووشتبوو زاناکە پێی وت (میلەتەکەت میلەتێکی خراپن ، جا لە فلانە شوێندا جێگایەکی ئاوها و

ئاوها هەیە کە خەڵکەکەیدا خوا دەپەرستن ، برۆ بۆ لایانئوا پەرستی لەگەڵ ئەواندا بکە)

٤- واز هێنان لە هاورێ (برادەر)ی خراپ : چونکە تەبیعەت لەوان دەدزیت ، وە بشزانە ئەوانە دەستبەردار نابن ، بە تایبەت ئەوان شەیتان لە پشتەوە هانیان دەدات وە رایان دەکێشێت لە بۆ کاری خراپە ، وە پاڵیان پێوە دەنێت ، وە رایان دەکێشێت هەروەها گەر توانیت ژمارە موبایلەکەت و ناونیشانی ماڵەکەت بگۆرە ، تەنانەت ئەو رێگایە بگۆرە کە پێشتر پێیدا رۆیشتویت (گەر توانیت) .

هەر بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت (الرجل على دين خليله ، فلينظر أحدكم من يخالل) [١١٠]

واتە : مرۆڤ لەسەر ئاینی هاورێکەیەتی ، جا بۆیە ووریا بن بزانن کێ دەکەنە هاورێی خۆتان

٥- بیر لە عاقیبەتی تاوان بکەوە : چونکە ئگەر مرۆڤ زانی تاوانەکان عاقیبەتیان خراپە و ناو دۆزەخە وە بەو سزاکەی

---

رواه ترمذی و ابو داود

چاوەڕێی دەکات ، وای لێدەکات پێش هەموو شتێک واز لە تاوانکردن بهێنێت ، وە تەوبە بکات لە تاوانەکان

٦- بەهەشت و ئاگری یاد بهێنەوە : بیری گەورەیی بەهەشت بهێنەوە ، وە ئەو خوایە تێدا ئامادەی کردووە بۆ یەکێک گوێرایەلی کردبێت و تەقوای ئەوی کردبێت ، وە جەهەنەم و ئەوەی کە تێیدا ئامادەکراوە بۆ ئەوەی سەرپێچیکاران بترسێنە کە تاوان دەکەن و بەردەوامن لەسەری .

٧- خۆت سەرقاڵکە بەوەی سوودبەخشە و خۆت لە تەنیایی و بەتاڵی بە دوور بگرە : چونکە نەفس ئەگەر سەرقاڵی نەکەی بە گوێرایەلیەوە سەرقاڵت دەکات بە سەرپێچیەوە . هەروەها دەست بەتاڵی سەردەکێشێ بۆ هەلدێر و لە ڕێلادان و مودمین بوون . وە لە دواییش سەردەکێشێ بۆ هاوڕێییەتی خراپ

٨- پێچەوانەی هەواو ئارەزوو : هیچ شتێک نییە بە ئەندازەی هەواو ئارەزوو مەترسیان بۆ سەر مرۆڤ هەبێت ، هەر بۆیە دەبینیت خوای پەروەدگار دەفەرموێ:﴿ أَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ

هَوَاهُ﴾ [١١١] ، بۆیە هەر کەسێک دەیەوێ تەوبەیەکی نەصوح بکات ، دەبێت خۆی لەو شتانە دارنێ کە دەیبەستێتەوە بە رابردووی تاوانیەوە ، وە نابێ دوای هەواو ئارەزووی خۆی بکەوێ

٩- وە کۆمەڵێک هۆکاری تر هەن بێجگەلە لەوانە یارمەتیت دەدەن بۆ تەوبەکردن : دوعاکردن لای خوا کە تەوبەیەکی ساغ و راستەقینەت پێ ببەخشی ، وە زیکری خواکردن و داوای لێخۆشبوون (اسغفر الله) کردن ، هیوا کورت بوون و یادی قیامەت کردن ، وە قورئان گەیشتن ، وە ئارامگرتن بە تایبەت لە سەرەتای تەوبەکردن ............هتد کۆمەڵێک شتی تر کە یارمەتیت دەدەن بۆ تەبو کردن و بەردەوام بوون لەسەر

---

[١١١] سورة الفرقان ٤٣

## مەرجەکانی تەوبەی ڕاستەقینە

١- ساغ بوون و بێخەوش بۆ خوای پایە بەرز : بەو پییەی کە هۆکاری تەوبەکردنەکەت خۆشویستنی خودا و بەگەورە ڕاگرتنی و هیوا بوون پیی و بەتاما بوونی پاداشتی خوای ، وە ترسان لە سزای ئەوی ، نەک نزیک بوونەوە بێ بۆ خەلکی ، وە مەبەستت پێی شتێک بێ لە شتەکانی دونیای فانی ، هەر بۆیە دەبینیت خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا وَأَصْلَحُوا وَاعْتَصَمُوا بِاللَّهِ وَأَخْلَصُوا دِينَهُمْ لِلَّهِ فَأُولَئِكَ مَعَ الْمُؤْمِنِينَ وَسَوْفَ يُؤْتِ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا[١١٢]﴾

واتە : ئەوانەیان نەبێت کە تەوبەی ڕاستەقینەیان کردووە و کار و نیەتیان چاککردووە بۆ خودا و دەستیان بە ئاینی خواوە گرتووە ، وە بە دینییان لەبۆ خوا ساغ و بێخەوش کردۆتەوە ، ئا ئەوانە لەگەڵ ئیمانداران دەبن

٢- واز هێنان لە تاوان : وا نەزانی تەوبەکەت ڕاستە لە کاتێکدا تەوبەت کردووە و کەچی بەردەوامیت لەسەر تاوان

---

[١١٢] سورة النساء ١٤٦

کردن ، بەڵام ئەگەر هاتوو گەرایەوە بۆ سەر تاوان دوای تەوبە کردنەکە ، ئەوا تەوبە پێشوەکەی بەتاڵ نابێتەوە بەڵکو پێویستی بە تەبەویەکی نوێ و تازە هەیە .

٣- داننان بە تاواندا ؛ چەنکە مومکین نیە مرۆڤ تەوبە بکا لە شتێک و بەتاووانی نەزانێت

٤- پەشیمان بوونەوە لەوەی لێت وەشاوەتەوە لە تاوان و سەرپێچی : وە چاوەرێی تەوبە ناکرێ مەگەر لە کەسێکی پەشیمان ، دڵتەنگ ، خەمبار بەوەی لێی وەشاوەتەوە لە سەرپێچێ و تاوان ، هەر بۆیە کەسێک کە باسی تاوانە پێشوەکانی خۆی دەکات و فەخر و شانازی پێوە دەکات بە تۆبەکار و پەشیمان نادرێتە قەڵەم هەروەکو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (( الندم التوبة )) [113]

واتە پەشیمان بوونەوە تەوبەیە

٥- سووربوون لەسەر نەگەرانەوە بۆ تاوان : تەوبەی کەسێک قبوڵ نیە نیەتی دووبارە گەرانەوەی هەبێت بۆ تاوان دوای

---

[113] صحيح الباني

تەوبەکردنەکەی ، بەڵکو پێویستە لەسەری دەستبەرداری تاوان کردن بێ ، وە بەردەوام بەڵێن بە خۆی بدات لە داهاتوودا نەگەڕێتەوە بۆسەر تاوان

٦- گەڕاندنەوەی مافەکان بۆ خاوەنەکانیان : ئەگەر هاتوو تاوانەکە پەیوەندیان بە مافی ئادەمیزاد هەبێت ، ئەوە پێویستە لەسەری مافەکانیان بۆ بگەڕێندرێتەوە ، ئەگەر ئەیەوێت تەوبەکەی راست قبوڵ بێت .لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ)کە دەفەرموێ: (( من كانت مظلمة لأحد من عرض أو شيء فليتحلله منه اليوم قبل ألا يكون دينار ولا درهم ، أن كان له عمل صالح أخذ بقدر مضلمته ، ون لم تكن له حسنات أخذ من سيئات صاحبه فحمل عليه ))[114]

واتە : هەر کەسێک زوڵم لە کەسێك کردوە و مافی لەسەرە ، جەستەی بێت یان هەر شتێکی تر ، با ئەمرۆ گەردن ئازادی لێ بکات ،پێش ئەوەی رۆژێک بێت دینار و درهەم سوودی نەبێت ، ئەگەر کردەوەی چاکی هەبێت لێی دەبردرێت بە ئەندازەی مافەکانی ، وە ئەگەریش چاکەی نەبێت ، ئەوا لە

---

رواه البخاري

کردەوە خراپەکانی (خاوەن حەق) هەڵدەگیرێ و دەدرێتە ستەمکارەکەدا

٧- ئەبێت تەوبەکە لە کاتیکدا قبوڵ ناکرێ : کە بریتیە لە پێش سەرە مەرگ و پێش هەڵاتنی خۆر لە خۆرئاوا وە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ((أن الله يقبل توبة العبد ما لم يغرغز ))[115]

واتە : بێگومان خوای گەورە تەوبەی تەوبەکاران قبوڵ دەکات ، هەتاوەکو پێش سەرە مەرگ

هەروەها دەفەرموێ (ﷺ): (( أن الله يبسط يده بالليل ليتوب مسىء النهار و يبسط يده بالنهار ليتوب مسىء الليل حتى تطلع الشمس من مغربها ))[116]

واتە : بەراستی پەروەردگار بەشەو دەستی رادەخات بۆ ئەوەی تاوانکارانی رۆژ تەوبە بکەن ، وە بە رۆژ دەستی رادەخات بۆ ئەوەی تاوانکاری شەو تەوبە بکەن ، هەتا ئەو کاتەی خۆر لە خۆر ئاوا هەڵدێ

---

رواه أحمد و ترمذى

رواه مسلم

## سەرچاوە


- كتاب \ مختصر صحيح مسلم
- كتاب \ مختصر صحيح بخارى
- كتاب \ فەرموودە صەحیحەکان
- كتاب \ كيف أتوب ؟
- م. محمد عبدالله فقى